به کەمترین کات و کار

# بەرەو لێخۆشبوونی پەروەردگار


دانانی
م. فاریق مەلا اسماعیل پیرزینی

## بزانە تەمەن چییە؟

ﷺعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) «أَعْمَارُ أُمَّتِي مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى السَّبْعِينَ وَأَقَلُّهُمْ مَنْ يَجُوزُ ذَلِكَ». رواه الترمذي (٣٥٥٠) و ابن ماجة (٤٢٣٦) وغيرهما.

واتە: پێغەمبەری خوا دەفەرمووێ (ﷺ) تەمەنی ئومەتەکەم لە نێوان (٦٠ تا ٧٠) ساڵ دەبێت زۆر بەکەمی تەمەنیان لەمە زیاتر دەبێت.

موسڵمانی بەرێز: ئێمەش لێرە لە شەش خاڵ تەمەنی کەسێك باس دەکەین کە (٦٣) ساڵ بێت بزانین چۆن ئەم تەمەنەی دەباتە سەر :

١- (٨) کاتژمێر کار کردن لە ڕۆژێکدا ئەمە یاسای نێودەوڵەتیە، دەکاتە (١٧) ساڵ تەنها کار کردنە.

٢- (٨) کاتژمێر نووستنە لە ڕۆژێکدا ئەمە یاسای پزیشکیە، بۆ ئەوەی لاشە پشو بدات، کەوا بوو (١٧) ساڵ نووستنە:

١٧+ ١٧ = ٣٤ ساڵ کار+ نووستن.

٣- ئێمە هەمووماں دەزانین کە مرۆڤ تا تەمەنی (١٥) ساڵی لەڕووی شەرعیەوە هیچی لەسەر نیە جا ئەم تەمەنە هەر بەگەمەو ڕابواردن دەباتە سەر کەوابوو:

٣٤ + ١٥= ٤٩ ساڵ منداڵی + کار + نووستن بە سەر دەبات.

٤- ڕۆژێ ١:٣٠ کاتژمێر بە خواردن وخواردنەوە دەباتە سەر نزیکەی (٣) ساڵ دەکات لە کۆی (٦٣) ساڵی :

٤٩ +٣ = ٥٢ ساڵ مندالی + کار + نووستن + خواردن وخواردنەوە بە سەر دەبات.

٥- جا ئەگەر باسی خوێندنیش بکەین لە کۆی (٢٢) ساڵ نزیکەی (٥) ساڵ خوێندنە:

٥٢ +٥ = ٥٧ ساڵ منداڵی + کار + نووستن + خواردن وخواردنەوە + خوێندن تەمەن دەچێتە سەر، (ئەوە بێجگە لە نەخۆشی و ناخۆشی خەمو پەژارە.. هتد کە بەرەنگاری مرۆڤ دەبێتەوە).

٦- (٦) ساڵ تەمەن دەمێنێت ئایا چۆن ئەم تەمەنە دەبەیتەسەر لە خوا پەرستی یان ڕابواردنی دونیا.

**ئاگاداری**: بنەمایەك هەیە کە دەڵێ (النیات تقلب العادات الی العبادات) واتە بە نیەت شتەکان دەبنە عیبادەت وەك نیەت لە نووستن ئەوە بێت تا لاشەت بەهێز بێت بۆ (عیبادەت) ئەوە بە (عیبادەت) دەژمێردرێت یاخود نیەت لە خواردن وخواردنەوە ئەوە بێت تا لاشەت بەهێز بێت بۆ (عیبادەت) ئەمەش بە (عیبادەت) دەژمێردرێت، هەروەها ئەگەر کارکردن بەحەڵاڵی بێت وە لە حەڵاڵیش ئەنجام بدرێت ئەوەش بە عیبادەتێکی گەورە دەژمێردرێت.

جا ئەگەر یەکێك باس بکەین کە هەموو نوێژەکانی لە مزگەوت بکات بزانیین هەمووی دەکاتە چەند؟.

ئەگەر یەکێك هەر پێنج نوێژ لە مزگەوت بکات لە هەر ڕۆژێك دەکاتە یەك کاتژمێر کەوابوو دەکاتە ( ٢) ساڵ لە کۆی تەمەنی (٦٣) ساڵی جا ئێمە لە (١٣) ساڵی حیسابمان کردیە ئەوجا دەکاتە (٢) ساڵ واتە لە کۆی (٥٠) ساڵ نوێژدا.

جا برای بەڕێزم من لێرە پرسیارێك دەکەم ئایە چ نەفامیەکە ئێمە نەتوانین لە ماوەی (٦٣) ساڵ تەنها (٢) ساڵ خوا پەرستی نەکین لەدونیایەکی کاتی بۆ

قیامەتێکی هەتا هەتایی با پەلە بکەین تا ئەمڕۆ کارە بەڵام لێپرسینەوە نییە چونکە لە دوا ڕۆژ تەنها لێپرسینەوە هەیە بەڵام کار نییە.

جا بزانە تەنها ئەمە لێکدانەوەیەکی گشتی یە جا هەر یەك لە ئێمە دەتوانێت بۆ خۆی ژیانی خۆی شی بکاتەوە ئایا بە چی بردۆتە سەر.

## نووسینی چاکە

۞عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ وَمَنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً. رواه البخاري (٦٤٩١).

واتە: لە پێغەمبەرمانەوە (ﷺ) کە لە خوای گەورە بۆمان دەگێڕێتەوە فەرموویەتی خوای گەورە کاری چاك و ناڕەوای نووسیوە، وە هەر دووکیانی باس کردوە، هەر یەکێك ویستی چاکەیەك بکات بەڵام نەیتوانی خوای گەورە چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسی، بەڵام ئەگەر ویستی چاکەیەك بکات وە لە دوایدا چاکەکەی کرد خوای گەورە (دە) چاکەی بۆ دەنووسی تاکو (حەوت سەد) جار تاکو چەند جارەی ترو زیاتریشی بۆ دەنووسرێ، بەڵام هەر یەکێك ویستی کارێکی ناڕەوا بکات بەڵام نەیکرد (واتە بۆی ڕەخسا بەڵام لە ترسی خوای گەورە وازی لێ هێنا) چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنوسرێ، بەڵام ئەگەر ویستی کارێکی ناڕەوا بکات جا لە دوایدا کارە ناڕەواکەی کرد خوای گەورە تەنها یەك تاوانی بۆ دەنووسێ.

بسم الله الرحمن الرحيم

## خێری فێربوونی قورئان و لەبەرکردن

قال الله تعالى: (إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ) [فاطر: ٢٩-٣٠].

۞عَنْ أَنَسٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِنَّ لِلَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَهْلِينَ مِنْ النَّاسِ قَالَ قِيلَ مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ أَهْلُ الْقُرْآنِ هُمْ أَهْلُ اللَّهِ وَخَاصَّتُهُ. رواه أحمد (١٢٢٩٢).

خاصته: اختصهم الله بزيادة فضل على غيرهم.

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی کەسانێك هەنە لەناو خەڵك کە ئەهلی خوای گەورەن، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوانە چ کەسانێکن، ووتی ئەوەی ئەهلی قورئان بێت (واتە قورئان فێر بێت وەخەلکیش فێری قورئان بکات) ئەوانەن ئەهلی خوای گەورەن وە لە تایبەتمندەکانن لەلای خوای بالاّ دەست (واتە خوای گەورە رێزی لێناون لەبەر گەورەیی قورئانی پیرۆز).**

۞عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) « الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ وَالَّذِى يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ ». رواه مسلم (١٨٩٨).

معاني بعض الكلمات:

(الماهر) هو الحاذق الكامل الحفظ الذي لا يتوقف ولا تشق عليه القراءة لجودة حفظه وإتقانه.

(مع السفرة) هم الملائكة.

(ويتتعتع) هو الذي يتردد في تلاوته، لضعف حفظه فله أجران: أجر للقراءة، وأجر للمشقة.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی ئەوانەی لەقورئان شارەزان (واتە لەبەریان کردوە وە بەرێك و پێکی قورئان دەخوێنن لە ڕووی تەجویدەوەش) لەگەڵ فریشتەکانن، وە ئەوەی ووشەیەك چەند جار دووبارە دەکاتەوە (واتە لەبەری نەکردووە جا بۆ دڵنیابوون لە خوێندنەوەی ئایا ڕاستە یانا ووشەکان دووبارە دەکاتەوە) پێی ماندوو دەبێت دوو پاداشتی هەیە (پاداشتی خوێندنەوە لەگەڵ پاداشتی ماندووبوونی).

## بەرز بوونەوەی پلەو پایە لە بەهەشت

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) «يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ اقْرَأْ وَارْتَقِ وَرَتِّلْ كَمَا كُنْتَ تُرَتِّلُ فِي الدُّنْيَا فَإِنَّ مَنْزِلَكَ عِنْدَ آخِرِ آيَةٍ تَقْرَؤُهَا». رواه ابو داود (١٤٦٦).

(يقال لصاحب القرآن) إذا دخل الجنة اقرأ واصعد فيقرأ ويصعد بكل آية درجة حتى يقرأ آخر شيء معه. فيض القدير شرح الجامع الصغير: ج ٣ ص ٣٦١.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی بە خاوەن قورئان خوێن دەڵێن (کاتێ چوو بۆ بەهەشت) قورئان بخوێنە هەر وەك چۆن لە دونیا دەتخوێند شوێن و ماڵت لەو جێگایەیە کە دوا ئایەت دەخوێنی (واتە کاتێ قورئان دەخوێنی بەهەر ئایەتێك پلەو پایەی بەرز دەبێتەوە لە بەهەشت تا خوێندنەوەی دواین ئایەت کە لە لایەتی).

۞عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا لَا أَقُولُ الم حَرْفٌ وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلَامٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ. رواه الترمذي (٢٩١٠) و البيهقي في شعب الإيمان (١٩٨٣) وغيرهما.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەكێك پیتێك لەقورئان بخوێنی چاكەیەكی بۆ دەنوسرێت وە چاكەش یەك بە (دە) یە، من پێتان ناڵێم كە (ألم) (واتە ئەوانە یەك پیتن) نەخێر بەڵكو ئەلف پیتێكە ومیم پیتێكەو لام پیتێكە (واتە الم سێ پیتە كەوابوو (٣٠) چاكەت بۆ دەنووسرێ)، جا موسڵمانی بەڕێز: بزانە كە قورئان لە (٣٢٣٦٧١) پیتە پێك هاتووە وە چاكەش یەك بە (دە) یە كەواتە:

٣٢٣٦٧١ × ١٠ =٣٢٣٦٧١٠ چاكەت بۆ دەنوسرێت ئەگەر قورئان خەتم بكەی.

بەڵام ئەگەر خوای گەورە یەك بە (٧٠٠) بۆت بنووسێ ئەوە:

٣٢٣٦٧١٠ × ٧٠٠ = ٢٢٦٥٦٩٧٠٠٠ چاكەت بۆ دەنوسرێت ئەگەر قورئان خەتم بكەی.

## قورئان خوێندن دەبێتە شەفاعەتكار بۆ خاوەنەكەی لە ڕۆژی دوایی

﴿عَنْ زَيْدٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَلاَّمٍ يَقُولُ حَدَّثَنِى أَبُو أُمَامَةَ الْبَاهِلِىُّ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِى يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ». رواه مسلم (١٩١٠).

معاني بعض الكلمات:

(الغيايتان) مثنى غياية وهى السحابة.

(الفرقان) الجماعتان.

(الصواف) جمع صافة وهى الباسطة أجنحتها فى الهواء.

(الزهراوين) سميتا الزهراوين لنورهما وهدايتهما وعظيم أجرهما.

(كأنهما غمامتان أو إنهما غيايتان) قال أهل اللغة الغمامة والغياية كل شيء أظل الإنسان فوق رأسه سحابة.

(كأنهما فرقان من طير صواف) وقوله من طير صواف جمع صافة وهي من الطيور ما يبسط أجنحتها في الهواء.

(تحاجان عن أصحابهما) أي تدافعان الجحيم والزبانية وهو كناية عن المبالغة في الشفاعة.

(البطلة) السحرة.

(ولا يستطيعها) أي لا يقدر على تحصيلها.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی قورئان بخوێنن لە بەر ئەوەی دەبێتە شەفاعەتكار بۆ خاوەنەكەی لە ڕۆژی قیامەت، بخوێنن دووگوڵەكە (لەبەر ئەوەی ناونراوە دوو گوڵ چونكە ڕووناكی هیدایەتو پاداشتی زۆر لەم دوو سورەتە هەیە) سورەتی البقرە و ال عمران لەبەر ئەوەی ئەم دوو سورەتە لە ڕۆژی قیامەت دێن**

وەك سێبەر لە سەر خاوەنەكەی یاخود وەك باڵندە هەردوو باڵەكانی دەكاتەوە (واتە دەبێتە پارێزەری لە دۆزەخ و زەبانیە، بە مانایەكی تر دەبنە تكاكار بۆ خاوەن قورئان خوێنەكە لە ڕۆژی دوایی)، سورەتی البقره بخوێنن چونكە دەست پێگرتنی بەرەكەتە، وازهێنانی پەشیمانییە، وە (سحر) جادووش ناتوانی هیچت لێ بكات).

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ الصِّيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ الصِّيَامُ أَيْ رَبِّ مَنَعْتُهُ الطَّعَامَ وَالشَّهَوَاتِ بِالنَّهَارِ فَشَفِّعْنِي فِيهِ وَيَقُولُ الْقُرْآنُ مَنَعْتُهُ النَّوْمَ بِاللَّيْلِ فَشَفِّعْنِي فِيهِ قَالَ فَيُشَفَّعَانِ. رواه احمد (٦٦٢٦) والحاكم في المستدركه (٢٠٣٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ڕۆژو قورئان شەفاعەتكارن بۆ بەندە لە ڕۆژی دوایی، ڕۆژو دەڵێ ئەی پەروەردگارە خواردنو خۆشیو ڕابواردنم لێ قەدەغە كردبوو بەڕۆژ، ڕێگام پێ بدە شەفاعەتی بۆ بەكەم، قورئان دەڵێ خەوم لێ قەدەغە كردبوو بە شەو، ڕێگام پێ بدە شفاعەتی بۆ بكەم، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی شەفاعەت دەكەن (واتە ڕۆژو قورئان).

۞عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ بَيْنَمَا جِبْرِيلُ قَاعِدٌ عِنْدَ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- سَمِعَ نَقِيضًا مِنْ فَوْقِهِ فَرَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ هَذَا بَابٌ مِنَ السَّمَاءِ فُتِحَ الْيَوْمَ لَمْ يُفْتَحْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ فَقَالَ هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلاَّ الْيَوْمَ فَسَلَّمَ وَقَالَ أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ فَاتِحَةُ الْكِتَابِ وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلاَّ أُعْطِيتَهُ. رواه مسلم (١٩١٣) و النسائي في الكبرى (٨٠١٤).

قوله: " سمع نقيضًا من فوقه " أي: صوتًا. والنقيض: صوت الباب عند فتحه.

واتە: کاتێ جبریل (علیه السلام) لای پێغەمبەر (ﷺ) دانیشتبوو گوێی لە کردنەوەی دەرگایەك بوو سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان فەرمووی دەرگایەك ئەمڕۆ لە ئاسمان کرایەوە هەرگیز پێشتر نەکرابووە تەنها ئەمڕۆ نەبێت، جا فریشتەیەکی لێ دابەزی ئینجا فەرمووی ئەوە فریشتەیە دابەزی بۆ سەر زەوی کە پێشتر هەرگیز دانەبەزیە تەنها ئەمڕۆ نەبێت جا سەلامی کرد ووتی موژدەت لێ بێ (واتە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە دوو ڕووناکی کە پێتدراوە کە بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراوە (یەکەم) سورەتی فاتیحەیە (دووەم) هەردوو ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی (الْبَقَرَة) یە بەهەرپیتێك لەو دووانە بخوێنی بە دڵنیایی پێت دەدرێت.

١- سورەتی فاتیحەیە هەموومان دەزانین ئەم سورەتە چیە کە ڕۆژانە (١٧) جار لە نوێژەکان دەخوێنین.

٢- ئەمەش دوو ئایەتەکەی لە کۆتای سورەتی (الْبَقَرَة):

(آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ (٢٨٥) لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ. (٢٨٦). سُورَةِ الْبَقَرَةِ.

## خێری سورەتی فاتیحە بزانە

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « قَالَ اللَّهُ تَعَالَى قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ). قَالَ اللَّهُ تَعَالَى حَمِدَنِي عَبْدِي وَإِذَا قَالَ (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). قَالَ اللَّهُ تَعَالَى أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي. وَإِذَا قَالَ (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ). قَالَ مَجَّدَنِي عَبْدِي. فَإِذَا قَالَ (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ). قَالَ هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ. فَإِذَا قَالَ (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ). قَالَ هَذَا لِعَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ ». رواه مسلم (٩٠٤) وغيره.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ خوای گەورە دەفەرمووێت نوێژم کردۆتە دوو بەش لەنێوان من و بەندەم، نیوە بۆ بەندەمە وە بۆ بەندەم هەیە هەرچی داوا بکا (واتە داوای چاك نەوەك خراپ)، جا ئەگەر بەندەکەم ووتی (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) واتە (هەموو سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری هەردوو جیهان) خوای گەورە دەفەرمووێت بەندەکەم سوپاس گوزاری کردم، وە کاتێ ووتی (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) واتە (بەخشندەی و میهرەبان) خوای گەورە دەفەرمووێت بەندەم مەدحی کردم، وە کاتێ بەندەکەم دەڵێت (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ) واتە (خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشت دانەوە) خوای گەورە دەفەرمووێت بەندەم بەگەورەی زانیم، وە ئەگەر بەندە ووتی (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) واتە (خوایە تەنها تۆ دەپەرستین وە تەنها لە تۆ داوای یارمەتی دەکەین) خوای گەورە دەفەرمووێت ئەمە لەنێوان من و بەندەکەمە وە بەندەکەم داواکەی قبوڵ بووە، وە ئەگەر بەندە ووتی (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ) (ڕێگای ڕاستمان نیشان بدە ئەو ڕێگایانەی کە نیعمەتت پێ دابوون (واتە وەك پێغەمبەرەکان و پیاوچاکان) وە لەوانەشمان نەکەی کە لێیان تورەی (وەك

جوولەكە) و لەگەڵ ئەوانەی كە ڕێگایان وون كردووە (وەك مسیحیەكان)، خوای گەورە دەفەرموێت ئەمە بۆ بەندەمە بەندەشم چ داوای هەیە داواكەی قبوڵ بووە.

## خێری سورەتی ئیخلاص بزانە

۞عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ صَاحِبِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ قَرَأَ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ حَتَّى يَخْتِمَهَا عَشْرَ مَرَّاتٍ بَنَى اللَّهُ لَهُ قَصْرًا فِي الْجَنَّةِ. رواه أحمد (١٥٦١٠).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەریەكێك (دە) جار** (قل هو الله احد.....) **ی بەتەواوی بخوێنی خوای گەورە كۆشكێكی بۆ دروست دەكات لەبەهەشت.**

۞عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ عَنِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم- قَالَ « أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ فِي لَيْلَةٍ ثُلُثَ الْقُرْآنِ » قَالُوا وَكَيْفَ يَقْرَأُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ قَالَ « (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) يَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ ». رواه مسلم (١٩٢٢).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی ئایە كێ هەیە لە ئێوە لە شەوێكدا نەتوانی (سێ) یەكی قورئان بخوێنێ؟ ووتیان چۆن (سێ) یەكی قورئان دەخوێندرێ؟ فەرمووی** (قل هو الله احد...**هتد) بە ئەندازەی (سێ) یەكی قورئان ە (واتە بەئەندازەی (دە) جزئی قورئان جا ئەگەر (سێ)** (قل هو الله احد....**هتد) بخوێنی وەك ئەوەیە كە خەتمی قورئانت كردبێت.**

**خوێندنی سورەتی** (اخلاص) (قل هو اللة احد ....هتد) **ئەگەر (٣) جار بخوێنی ئەوە خێری خەتمی قورئانت بۆ دەنوسرێ جا موسوڵمانی بەڕێز دەتوانی لە یەك دەقیقە (١٢) جار** (قل هو اللة احد.... **هتد) بخوێنی كەدەكاتە (٤) خەتمی قورئان.**

جا وادابنێن کەموسوڵمانێك ڕۆژانە لە یەك دەقە (١٢) جار سورەتی اخلاص دەخوێنێت ئەوە بەم شێوەی خوارەوە بۆی دەژمێردرێت:

| |
|---|
| لە یەك ڕۆژ (١٢) جار قل هو الله احد... هتد خوێند. دەکاتە (٤) خەتمی قورئان |
| ٤×٣٠= ١٢٠ خێری خەتمی قورئان لە یەك مانگ بۆت دەنوسرێت |
| ١٢٠×١٢= ١٤٤٠ خێری خەتمی قورئان لە (یەك) ساڵ بۆت دەنوسرێت |
| ١٤٤٠×١٠= ١٤٤٠٠ خێری خەتمی قورئان لە (دە) ساڵ بۆت دەنوسرێت |

**تێبینی**.. ئەوە ئەگەر یەك بە (١٠) بێت جا ئەگەر خوای گەورە یەك بە (٧٠٠) بۆت بژمێرێ دەکاتە:

| |
|---|
| ٤ × ٧٠٠ = ٢٨٠٠ خێری خەتمی قورئان لەیەك ڕۆژ بۆت دەنوسرێت |
| ٢٨٠٠ × ٣٠ = ٨٤٠٠٠ خێری خەتمی قورئان لەیەك مانگ بۆت دەنوسرێت |
| ٨٤٠٠٠ × ١٢ = ١٠٠٨٠٠٠ خێری خەتمی قورئان لەیەك ساڵ بۆت دەنوسرێت |
| ١٠٠٨٠٠٠ × ١٠ = ١٠٠٨٠٠٠٠ خێری خەتمی قورئان لە(دە)ساڵ بۆت دەنوسرێت |

یاخود بە بێ ژمارە لە بۆ ئەو موسڵمانانە زیاد دەکات کە خوای گەورە ویستی لەسەر بێت واتە لە (٧٠٠) زیاتریش حیساب دەکا هەروەك لەم فەرموودە هاتووە:

۞قَالَ صلى الله عليه وسلم- "فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً فَإِنْ هُوَ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ لَهُ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ إِلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ). رواه البخاري (٦٤٩١).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەكێك ویستی چاكەیەك بكات بەڵام نەیكرد خوای گەورە چاكەێكی تەواوی بۆ دەنووسێت, بەڵام ئەگەر ویستی چاكەیەك بكات لەدوادا چاكەكەی ئەنجامدا خوای گەورە ( دە ) چاكەی بۆ دەنووسێت تاكو (حەوت سەد )جار وەزۆر زیاتریشی بۆ دەنووسی.**

**هەروەها ئەم ئایەتەش كە باسی نووسینی چاكە دەكات خوای گەورە دەفەرمووێ** (مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) سورة البقرة **(٢٦٠).**

**واتە: نمونەی ئەو كەسەی كە خێرێك بكات وەك ئەوەیە دەنكە گەنمێك بچێنێ ئەو دەنكە گەنمش حەوت گوڵە گەنم بگرێت وە هەر گوڵە گەنمێكیش سەد دەنكی تێدابێت (كەواتە دەكات (٧٠٠) چاكەی بۆ دەنووسرێ) یاخود خوای گەورە ئەگەر ویستی لەسەر بێت لەوەش زیاتر دەكات بە چەند جارەی تریش كە بەس خوای گەورە دەزانی چەندە.**

۞عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ وَكَانَ يَقْرَأُ لأَصْحَابِهِ فِي صَلاَتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِ (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) فَلَمَّا رَجَعُوا ذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ « سَلُوهُ لأَىِّ شَىْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ ». فَسَأَلُوهُ فَقَالَ لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ ». رواه مسلم (١٩٢٦).

(فيختم) لهم أي قراءته (بقل هو الله أحد) السورة إلى آخرها وهذا يدل على أنه كان يقرأ بغيرها ثم يقرؤها في كل ركعة وهذا هو الظاهر. مشكاة المصابيح (٢١٤٩).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکێکی نارد کە پێشەوایەتی کۆمەڵە صحابەیەک بکات ئەویش لەنوێژەکاندا (واتە لە ڕەکەعتی یەکەم و دووەمی) (قل هو الله احد...) ی بە تەواوی بۆ دەخوێندن کاتێ گەڕانەوە ئەمەیان بە پێغەمبەر (ﷺ) ووت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێی بڵێن لەبەر چی وای کردووە؟ جا پرسیاریان لێ کرد: ووتی لەبەر ئەوەی وەصفی خوای بەخشندەیە لەبەرئەوە پێم خۆشە ئەم سورەتە بخوێنم (واتە لەلام خۆشەویستە)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێ بڵێن خوای گەورە خۆشی دەوێت.

## خێری سورەتی کهف بزانە

۞عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم، قَالَ: مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ. رواه المستدرك (٣٣٩٢) و سنن الكبرى للبيهقي (٥٧٩٢ ).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك لەڕۆژی هەینی (جمعە)دا سورەتی کهف بخوێنێت ڕووناکییەك دەدرەوشێتەوە لە نێوان دوو هەینی (جمعە)دا (واتە لەو هەینییەی (جمعە)ی کە دەخوێنێت تا هەینی (جمعە)ی دادێ).**

۞عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ أَنَّ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ عُصِمَ مِنَ الدَّجَّالِ ». رواه مسلم (١٩١٩).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك (دە) ئایەت لەسەرەتای سورەتی کهف لەبەر بکات لە دەجال دەپارێزرێت.**

۞عن أبي سعيد الخدري قال: قال النبي صلى الله عليه و سلم: من قرأ سورة الكهف يوم الجمعة أضاء له من النور ما بينه و بين البيت العتيق. رواه البيهقي في شعب الإيمان (٣٠٣٩) و الدارمي (٣٤٠٧) وغيرهما. قال الإمام الحافظ: اسناده حسن. ينظر في كتاب التيسير بشرح الجامع الصغير ج٢ ص٨٤٤.

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك لەڕۆژی هەینی (جمعە)دا سورەتی کهف بخوێنێت ڕووناکێك دەدرەوشێتەوە لە نێوان کەسە قورئان خوێنەکەو وبیت العتیق (کە لە ئاسمانی حەوتەمە).**

## خێری ئایەتی (الْكُرْسِيِّ) بزانە

۞عن أَبَا أُمَامَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ :"مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْجَنَّةِ ، إِلا الْمَوْتُ". رواه الطبراني في الكبير (٧٤٠٨) و النسائي في الكبرى (٩٩٢٨) وغيرهما.

**واتە: پێغەمبەرمان (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمْ) فەرموویەتی هەر یەکێك پاش هەموو نوێژە فەرزەکانی ئایەتی کورسی بخوێنێت** (اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ)، البقرة (٢٥٥)، **ئەوە هیچ شتێك نابێتە ڕێگر بۆ چوونە بەهەشتی، تەنها مردن نەبێت (واتە پاش ئەوەی دەمرێت دەچێت بۆ بەهەشت).**

## خێری دەست نوێژ بزانە

۞عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ قَالَ كَانَتْ عَلَيْنَا رِعَايَةُ الإِبِلِ فَجَاءَتْ نَوْبَتِى فَرَوَّحْتُهَا بِعَشِىٍّ فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَائِمًا يُحَدِّثُ النَّاسَ فَأَدْرَكْتُ مِنْ قَوْلِهِ « مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهُ ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّى رَكْعَتَيْنِ مُقْبِلٌ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ إِلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ »، قَالَ فَقُلْتُ مَا أَجْوَدَ هَذِهِ. فَإِذَا قَائِلٌ بَيْنَ يَدَىَّ يَقُولُ الَّتِى قَبْلَهَا أَجْوَدُ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ قَالَ إِنِّى قَدْ رَأَيْتُكَ جِئْتَ آنِفًا قَالَ « مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ - أَوْ فَيُسْبِغُ - الْوُضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ ». رواه مسلم (٥٧٦). وزاد الترمذي: « اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ » (٥٥).

معاني بعض الكلمات:

(ما أجود هذه) يعني هذه الكلمة أو الفائدة أو البشارة أو العبادة وجودتها من جهات منها أنها سهلة متيسرة بقدر عليها كل أحد بلا مشقة ومنها أن أجرها عظيم.

(آنفا) أي قريبا.

(فيبلغ أو يسبغ) هما بمعنى واحد أي يتمه ويكلمه فيوصله مواضعه على الوجه المسنون.

(كانت علينا رعاية الإبل) يعني: إبل الصدقة المنتظر بها تفريقها، أو الإبل المعدة لمصالح المسلمين.

(فروحتُها بعشي) يعني: رددتُها إلى حيث تبيتُ. والْمُراح - بضم الميم -: مبيتُ الماشية.

واتە: (عُقْبَةَ) ووتی لەسەرمانبوو سەرپەرشتی ووشترەکان بکەین (کە لە بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان ئامادە کرابوون) جا نۆرەی من هات، تا من ووشترەکانم برد شوێنی خۆیان هەر بەوەندە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتم کە بە ڕاوەستاوی قسەی بۆ خەڵك دەکرد دەیفەرموو (هەر موسڵمانێك دەستنوێژ بشوات، بەڵام دەستنوێژەکەی تەواو بێت (واتە چۆن پێغەمبەرمان (ﷺ)

شوشتویەتی) لەپاشان هەڵسێ دوو ڕەکعەت نوێژ بکات بە دڵ و دەروونێکی تەواو (واتە بیر و هۆشی هەر لەگەڵ نوێژەکە دا بێت تا تەواو دەبێت) ئەوا بە دڵنیایی بەهەشتی بۆ دەبێت)، ووتم ئەم ووشانە چەند بەسوودو ئاسان و مژدە بەخشن، جا گوێم لە یەکێك بوو ووتی لەمەش باشترو بە سوودتری باس کرد (واتە پێغەمبەر (ﷺ) بینیم تۆ تازە هاتی تەماشام کرد (عمر) بوو ووتی (واتە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی) (هەر یەکێك لە ئێوە دەستونوێژ تەواو بشوات (واتە سوننەتەکانی هەموو لێ دەهاتە جێ) لە پاشان بڵێ (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ (وە ترمذي ئەمەی زیاد گێڕاوەتەوە) اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ المتَطَهِّرِينَ) بە دڵنیاییەوە هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە ئارەزووی بە کامە بوو بەو دەرگایە دەچێت (بۆ ناو بەهەشت).

۞عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ – رضى الله عنه – أَنَّهُ دَعَا بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْمِرْفَقِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَهُ الْيُمْنَى إِلَى الْكَعْبَيْنِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ غَسَلَ الْيُسْرَى مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم- تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِى هَذَا ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم- « مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِى هَذَا ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ ». رواه البخاري (١٦٤) ومسلم (٥٦٠).

(لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ) أي لا يحدث بشيء من أمور الدنيا.

**واتە:** ئیمامی (عثمان) داوای دەستنوێژ شوشتنی کرد دەستنوێژی گرتو لە کۆتایی دەستنوێژەکەیدا فەرمووی: پێغەمبەرم (ﷺ) دیت بەم شێوەیەی من دەستنوێژی گرت، لە سەرەتادا هەردوو دەستەکانی سێ جار شۆردن، ئینجا ئاوی

لە دەمی وەرکردو لە پاشان ئاوی لە لووتی وەرکردو ئاوەکەی فڕێدا دەرەوە، ئینجا ڕوخساری سێ جار شۆرد، ئینجا دەستی ڕاستەی لەگەڵ ئەنیشکدا سێ جار شۆرد، ئینجا دەستی چەپەشی وەکو ڕاستە لەگەڵ ئەنیشکدا سێ جار شۆرد، ئینجا سەری مەسح کرد، ئینجا پێی ڕاستەی لەگەڵ گۆزینگەکەی سێ جار شۆرد، ئینجا پێی چەپەشی وەکو ڕاستە لەگەڵ گۆزینگەکەی سێ جار شۆرد، ئینجا ووتی پێغەمبەرم (ﷺ) دیت بەم شێوەیەی دەستنوێژی گرت هەروەك من (واتە هەروەك ئێستا دەستنوێژم لە پێشتان شوشت)، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەر یەكێك وەك من دەستنوێژ بشوات ئینجا لە پاشان هەڵسا دوو ڕەكعەتی كرد بەڵام لەناو نوێژدا دالّغان لێنەدات (واتە بیرو هۆشی لەناو نوێژدا بڕوات بەڵكو دەبێت بیر لە واتاكانی نوێژ بكاتەوە) ئەوە خوای گەورە لە هەموو گوناهەكانی پێشووی خۆش دەبێت.

۞عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَنْ تَوَضَّأَ لِلصَّلاَةِ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ ثُمَّ مَشَى إِلَى الصَّلاَةِ الْمَكْتُوبَةِ فَصَلاَّهَا مَعَ النَّاسِ أَوْ مَعَ الْجَمَاعَةِ أَوْ فِى الْمَسْجِدِ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ ذُنُوبَهُ ». رواه مسلم (٥٧١).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ هەر یەكێك دەستنوێژی گرت وە دەستنوێژەكەی بە تەواوی شووشت (واتە هەروەك چۆن پێغەمبەرمان (ﷺ) دەیشوشت) ئینجا بەرەو نوێژی فەڕزەكان ڕۆیشت و نوێژی لەگەڵ خەڵك كرد یاخود لەگەڵ كۆمەڵێك یاخود لەمزگەوت، ئەوە خوای گەورە لە گوناهەكانی خۆش دەبێت.

﴿عَن أَبِي هُرَيْرَةَ قال قَالَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ، أَوِ الْمُؤْمِنُ فَغَسَلَ، وَجْهَهُ خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ، أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ، أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ خَرَجَ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ. رواه مسلم (٦٠٠) و الدارمي (٧١٨) و مالك في الموطأ (٨٥).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئەگەر بەندەکی موسڵمان یاخود ئیماندار دەستنوێژی شووشت جا کاتی ڕوخساری دەشوات ئەوە هەموو ئەو تاوانانەی کە بە چاوی کردوویەتی لە سەری لا دەچێت بە ئاو، یان لەگەڵ دوا دڵۆپە ئاوەکە (کە لە ڕوخساری دەتکێتەوە)، وە ئەگەر دەستەکانی شووشت هەموو گوناهەکانی لە سەر لا دەچێت کە بە دەست ئەنجامی داوە، یاخود لەگەڵ دوا دڵۆپە ئاوەکە (کە لە دەستی دەتکێتەوە)، وە ئەگەر پێیەکانی شووشت هەموو گوناهەکانی لە سەر لادەچێت کە بە پێ بۆی چووە بۆ گوناهکردن، یاخود لەگەڵ دوا دڵۆپە ئاوەکە (کە لە پێی دەتکێتەوە)، هەتاکو بە پاکی لە گوناهەکان دەردەچێت (واتە هیچ گوناهی بچووکی لە سەر نامێنێ).

جا ئیمانداری بەڕێز: بۆ ئەوەی ئەم هەلە لە دەست نەدەین با بۆ هەموو فەڕزەکان دەستنوێژ بشۆین تاکو هەردەم پاك بینەوە لە گوناهەکان.

## خێری وەڵام دانەوەی بانگ

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْمُؤَذِّنِينَ يَفْضُلُونَا بِأَذَانِهِمْ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قُلْ كَمَا يَقُولُونَ فَإِذَا انْتَهَيْتَ فَسَلْ تُعْطَ. رواه أحمد بن حنبل (٦٦٠١) و ابو داود (٥٢٤) وغيرهما.

واتە:عبداللەی کوڕی عمر ووتی پیاوێك بە پێغەمبەری (ﷺ) ووت ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بانگدەرەکان لە ئێمە باشترن لە بەر خێری بانگدان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بڵێ چۆن ئەوان دەیڵێن وە ئەگەر بانگ تەواو بوو داوا بکە داواکەت جێ بەجێ دەکرێت.

۞عَنْ أَبَا هُرَيْرَةَ قال كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِتَلَعَاتِ الْيَمَنِ فَقَامَ بِلَالٌ يُنَادِي فَلَمَّا سَكَتَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ هَذَا يَقِينًا دَخَلَ الْجَنَّةَ. رواه ابن حبان ( ١٦٦٧) و احمد (٨٦٠٩).

معاني بعض الكلمات:

(فَقَامَ بِلَالٌ يُنَادِي) أي يؤذن للصلاة.

(فَلَمَّا سَكَتَ) أي فرغ.

(مَنْ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ هَذَا) أي القول مجيباً، أو مؤذناً، أو مطلقاً.

(يَقِينًا) أي خالصاً مخلصاً من قلبه.

(دَخَلَ الْجَنَّةَ) أي أستحق دخول الجنة. مشكاة المصابيح ج٢ ص ٧٦٩.

واتە: ابو هریرە ڕەزای خوای لێبی ووتی لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) بووین لە یەمەن شوێنێك هەبوو ناوی (بتلعات) بو (بلال) (بانگیدا بۆ نوێژ) وەکاتی تەواو بوو (لە بانگ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەر یەکێك وەکو ئەو بانگبێژە بیڵێ (واتە وەڵامی بانگی داوە) شایستەی ئەو دەبێت بچێتە بەهەشت.

۞عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ « مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا. غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ ». رواه مسلم(٨٧٧).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك پاش ئەوەی گوێی لە بانگدەر بوو بڵێ** (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا) **(واتە من شایەدی دەدەم بە تاکو تەنهایی خوای گەورە کە هیچ شەریکی نییە وە محمد (ﷺ) بەندەو پێغەمبەری خوای گەورەیە، ڕازیمە بە پەروەردگاری خوای گەورە وە محمد (ﷺ) پێغەمبەرمە وە ئیسلام ئایینمە، جا وا سوننەتە بەعەرەبی ئەمە بڵێ) خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ.**

۞عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. فَقَالَ أَحَدُكُمُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ثُمَّ قَالَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. قَالَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. ثُمَّ قَالَ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ. قَالَ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. ثُمَّ قَالَ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ. قَالَ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. ثُمَّ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. ثُمَّ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ ». رواه مسلم (٨٧٦).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئەگەر بانگدەر ووتی** (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) **یەکێك لە ئێوە ووتی** (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) **لە پاشان (بانگدەر) ووتی** (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **ئەویش ووتی** (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ) **لە پاشان (بانگدەر) ووتی** (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ) **ئەویش ووتی** (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) **لە پاشان (بانگدەر) ووتی**

(حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ) **ئـەویش ووتـی** (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ) **لـە پاشـان (بانگـدەر) ووتی** (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) **ئەویش ووتی** (اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ) **لـە پاشـان (بانگـدەر) ووتـی** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **ئـەویش ووتـی** (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) **بـە دڵ ئەمانـە بڵـێ دەچـێتە بەهەشت.**

**موسڵمانی بەڕێز: تەنها چوار خولەك دڵ و دەرونت بۆ خـوا بـێ ئـەوا بەهەشت بەدەست دێنـی چونکە بـانگ هـەر چـەندە درێـژ بێـت لـە چـوار تـا پێـنج خولـەك تێناپەڕێ.**

﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه البخاري (٦١٤) وغيره.

(حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي): معناه نالته وحصلت له ووجبت. فتح الباري ج ٣ ص ٤٧٠.

**واتـه: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك کاتی گوێی لە بـانگ بـوو بڵـێ "** اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ **" شەفاعەتی منی بۆ واجب دەبێ لە ڕۆژی دوایی.**

## سەڵاوات لێدان لە دوای بانگ

﴿عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِى الْجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِى إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ تَعَالَى وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ فَمَنْ سَأَلَ اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ عَلَيْهِ الشَّفَاعَةُ. رواه مسلم (٨٧٥) و ابو داود (٥٢٣ ).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ کاتێك گوێتان لە بانگدەر بوو، ئێوەش وەکو بانگدەر بڵێن واتە: وەڵامی بانگ بدەنەوە، ئینجا صەڵاوات لە سەرمن لێبدەن(بەڵام بەداخەوە تەنها بانگدەر صەڵاوەت لیدەدات خەڵك زۆر بەکەمی صەڵاوەت لێدەدەن) چونکە هەر کەسێك یەك صەڵاواتم لە سەر لێبدا، خوای گەورە (دە) ڕەحمەتی بەسەردا دەبارێنی، ئینجا دوعای (وَسِيلَة)م بۆ بکەن چونکە (وَسِيلَة) پلەیەکە لە بەهەشتدا تەنها بۆ یەك کەس لە بەندەکانی خوا داندراوە، تکام وایە من ئەو بەندەیە بم هەر کەسێك دوعای (وسيلَة)م بۆ بکا مسۆگەرە شەفاعەتی منی دەگاتێ.

ئەمەش دوعای (وسيلة )یە کە لە دوای صەڵاواتی پاش بانگ دەگوترێ: ﴿اَللّٰهُمَّ رَبَّ هٰذِهِ الدَّعْوَةِالتَّامَّةِ وَالصَّلاةِالْقائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً اَلْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَة، وَابْعَثْهُ مَقاماً مَحْمُوداً اَلَّذِی وَعَدْتَهُ﴾. **رواه البخاري (٦١٤).**

## خێری نوێژی بەکۆمەڵ

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلَّا رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلْ الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ وَلَا يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظَرَ الصَّلَاةَ. رواه البخاري (٦٤٧).

معاني بعض الكلمات:

(تضعف) تزاد.

(فأحسن الوضوء) بإسباغه والإتيان بآدابه وسننه.

(لا يخرجه إلا الصلاة) ليس له قصد بالخروج من بيته إلا الصلاة.

(درجة) مرتبة في الجنة.

(في صلاة) في حكم الصلاة يكتب له أجرها وثوابها.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی نوێژی پیاو بە کۆمەڵ (جماعە) خێری زیاتر دەبێت لەو نوێژانەی کە لە ماڵ یا لە بازاڕ دەکات بە بیست وپێنج نوێژ (واتە یەك بە بیست وپێنج نوێژ هەیە لە فەرموودەی تریش هاتیە کە یەك بە بیست و حەوت نوێژ هەیە)، بەمەرجێك ئەگەر هاتوو دەست نوێژیکی تەواو بشوات (واتە بە زیادکردنی شوێنی شوشتن وە لەجێ بەجێ کردنی سوننەتەکان و ئادابی دەست نوێژ) ئینجا لە ماڵ هاتەدەر بۆ مزگەوت چوو نیەتی دەرچوونەکەی بەس بۆ نوێژ بێت (واتە بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورە)، ئەوە بەهەر هەنگاوێك پلەیەك بەرز دەبێتەوە وە گوناهێکی لەسەر لادەچێت وە کاتی نوێژی کرد ئەوە فریشتەکان دەفەرموون خوایە صەڵاواتی تویان لەسەر بێت خوایە ڕەحەمیان پێ بکەی هەر ئەم دوعایەی بۆ دەکەن (تا دەڕواتە دەرەوە لە مزگەوت)، وە هەریەك لە ئێوە هەر لە ناو نوێژدان (واتە پاداشتی نوێژتان بۆ دەژمێردرێ) مادام چاوەڕێی نوێژ دەکەن.

۞عَنْ أَبِي عُثْمَانَ قَالَ: كَتَبَ سَلْمَانُ إِلَى أَبِي الدَّرْدَاءِ يَا أَخِي لِيَكُنِ الْمَسْجِدُ بَيْتَكَ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ: "الْمَسْجِدُ بَيْتُ كُلِّ تَقِيٍّ، وَقَدْ ضَمِنَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لِمَنْ كَانَ الْمَسَاجِدُ بُيُوتَهُ الرَّوْحَ، وَالرَّحْمَةَ، وَالْجَوَازَ عَلَى الصِّرَاطِ". رواه الطبراني في الكبير (٦١٤٣) و البزار (٢٥٤٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی مزگەوت ماڵی هەموو لە خوا ترسێکە، وە خوای گەورە بۆی مسۆگەر کردووە بۆ ئەو کەسانەی کە مزگەوتیان کردۆتە شوێنی خۆیان (واتە زۆر هاتوو چووی مزگەوت دەکەن) بۆیان دەبێت ڕەحمەتوو پەڕینەوە لە (صراط) (پردێکە لە سەر جهنم).

۞عَنْ أَبِى أُمَامَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ :« مَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ مُتَطَهِّرًا إِلَى صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْحَاجِّ الْمُحْرِمِ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى تَسْبِيحِ الضُّحَى لاَ يُنْصِبُهُ إِلاَّ إِيَّاهُ فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْمُعْتَمِرِ، وَصَلاَةٌ عَلَى إِثْرِ صَلاَةٍ لاَ لَغْوَ بَيْنَهُمَا كِتَابٌ فِى عِلِّيِّينَ ».. رواه ابو داود (٥٥٨) و الطبراني في الأوسط (٣٢٦٢) و البيهقي في الكبرى (٤٦٨٩).

معانى بعض الكلمات:

(إلى تسبيح الضحى) يريد صلاة الضحى، في المسجد افضل.

(لا ينصبه) أي: لا يتعبه. شرح السنة للإمام البغوى ج٢ ص ٣٥٧.

(صَلاَةٌ عَلَى إِثْرِ صَلاَةٍ) أي صلاة تتبع صلاة وتتصل بها فرضا أو غيره.

(لا لغو بينهما) أي: بين الصلاتين، واللَّغْوُ: كلام باطل.

(كتاب في عليين) أي مكتوب تصعد به الملائكة المقربون إلى عليين لكرامة المؤمن وعمله الصالح. التيسير بشرح الجامع الصغير ج٢ ص١٩٧.

(كتابٌ) أي: مكتوبٌ أي: مما يكتبُ في عليين، وهي لوح من زبرجدة خضراء معلق تحت العرش، فيها أعمال المؤمنين. شرح سنن أبي داود ج٥ ص١٨٦.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك بەدەست نوێژ لە ماڵ بچێتە دەرەوە بۆ نوێژە فەڕزەکان ئەوە پاداشتی وەك پاداشتی ئەو حاجییەیە کە لە ئیحرامدایە ، وە هەر یەکێك بۆ چێشتەنوێژ لە ماڵ بچێتە دەرەوە (وا باشە لە مزگەوت بکرێت )وە ماندووی نەکا ئەوە پاداشتی وەك پاداشتی عومرەیە(کەوابوو هەموو ڕۆژێك کە بۆ مزگەوت دەچی بۆ نوێژی چێشتەنوێژ خێری عورەت بۆ**

دەنووسرێت) ، وە نوێژ لە دواى نوێژ کە دەکرێت واتە نوێژە فـەرزەکان (هـەمووى لە مزگەوت بکات) وە قسەى نارەواى نـەکرد، ئـەوە فريشتەکان بـۆى دەنووسن وەبەرزى دەکەنـەوە بـۆ شوێنێك کە نـاوى(عليين) کە لـە لەوحـەى زەبەرجـەدى (رەنگى) کەسکە لە ژێر عەرشى خواى گـەورە بـۆى هەڵدەواسن کـە کـاروکردەوى ئيماندارانى تێدا نووسراوە.

ئيماندارى بەرێز: سەيرى ئەم خشتەيە بکە ئەگەر يەکێك تەنها بـۆ مـاوەى (١٠) ساڵ بچێت بۆ مزگەوت تا نوێژى جەماعەتى لىَ بکات بزانە خێرى چەند( حـەج)ت بۆ دەنووسرێت:

| |
|---|
| لە يەك رۆژدا (٥) جار نوێژ لـە مزگـەوت دەکرێـت کـەوابوو خێـرى (٥)( حـج )ت بـۆ دەنووسرێت |
| ٥×٣٠= ١٥٠ خێرى حەج لە (يەك) مانگ بۆت دەنوسرێت |
| ١٥٠×١٢= ١٨٠٠ خێرى حەج لە (يەك) ساڵ بۆت دەنوسرێت |
| ١٨٠٠ ×١٠= ١٨٠٠٠ خێرى حەج لە (دە) ساڵ بۆت دەنوسرێت |

**جا کەس هەيە ئەم خێرە بزانى لە دەستى خۆى بدا!!!!.**

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ. رواه البخاري (١١٩٠) و مسلم (٣٤٤٠).

**واتە :پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموويەتى يەك نوێژ لە مزگەوتى من بەهەزار نوێژ هەيە ئەگەر لە مزگەوتێکى تر بێت تەنها لە مزگەوتى حەرەم نەبێت (واتە کەعبـەى پيرۆز چونکە ئەو خێرى زياترە).**

**جا موسڵمانى بـەرێز: کـاتىَ سـەفەردەکەى بـۆ حـەج يـا عـومرە ئـەم هەلـە لـە دەسـتە خـۆت مـەدە هـەموو نوێـژەکان بـە کۆمـەڵ (جماعـە) بکـە وە هـەروەها**

سوننەتەکانی پێش وپاشی نوێژەکانیش بکە هەر وەك چۆن پێغەمبەرمان (ﷺ) پێ ووتینە، چونکە ئەویش یەك بە هەزارە.

۞عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِى عَمْرَةَ قَالَ دَخَلَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ الْمَسْجِدَ بَعْدَ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ فَقَعَدَ وَحْدَهُ فَقَعَدْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ يَا ابْنَ أَخِى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِى جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِى جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ ». رواه مسلم (١٥٢٣).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووی هەر یەکێك نوێژی شێوان (الْعِشَاءَ)ی بەکۆمەڵ (جماعە) بکات وەك ئەوەیە نیو شەوی هەڵسابێ (واتە بۆ خواپەرستی)، وەهەر یەکێك نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ (جماعە) بکات وەك ئەوەیە شەوەکەی هەمووی نوێژی کردەبێت (واتە نوێژی شێوان بە کۆمەڵ نیو شەو دەژمێردرێت لە خواپەرستی وە نیوەکەی تر بەوە تەواو دەبێت کە نوێژی بەیانیش بە کۆمەڵ بکەی، کەوابوو ئەگەر هەردوو نوێژت بە کۆمەڵ کرد شەوەکەی هەموو بە خواپەرستی بۆ دەژمێردرێت).

۞عَنْ أُبَىِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَوْمًا الصُّبْحَ فَقَالَ « أَشَاهِدٌ فُلاَنٌ ». قَالُوا لاَ. قَالَ « أَشَاهِدٌ فُلاَنٌ ». قَالُوا لاَ. قَالَ « إِنَّ هَاتَيْنِ الصَّلاَتَيْنِ أَثْقَلُ الصَّلَوَاتِ عَلَى الْمُنَافِقِينَ وَلَوْ تَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَيْتُمُوهُمَا وَلَوْ حَبْوًا عَلَى الرُّكَبِ وَإِنَّ الصَّفَّ الأَوَّلَ عَلَى مِثْلِ صَفِّ الْمَلاَئِكَةِ وَلَوْ عَلِمْتُمْ مَا فَضِيلَتُهُ لاَبْتَدَرْتُمُوهُ وَإِنَّ صَلاَةَ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ وَحْدَهُ وَصَلاَتُهُ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ مَعَ الرَّجُلِ وَمَا كَثُرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى ». رواه أبو داود (٥٥٤) و البيهقي في سنن الكبرى (٥٣٩٨).

معاني بعض الكلمات:

(أشاهد فلان) أي أحاضر صلاتنا هذه.

(أثقل الصلوات على المنافقين) لغلبة الكسل فيهما ولقلة تحصيل الرياء لهما.

(ولو تعلمون) أنتم أيها المؤمنون.

(ما فيهما) من الأجر والثواب الزائد لأن الأجر على قدر المشقة.

(لأتيتموهما) أي الصبح والعشاء.

(ولو حبوا) أي زحفا ومشيا.

(على الركب) قال الطيبي حبوا خبر كان المحذوف أي ولو كان الإتيان حبوا وهو أن يمشي على يديه وركبتيه أو إسته ويجوز أن يكون التقدير ولو أتيتموهما حبوا أي حابين تسمية بالمصدر مبالغة.

(وإن الصف الأول) أي في القرب من الله تعالى والبعد من الشيطان الرجيم.

(على مثل صف الملائكة) وقال الطيبي شبه الصف الأول في قربهم من الامام بصف الملائكة في قربهم من الله تعالى والجار والمجرور خبر إن والمتعلق كائن.

(ما فضيلته) أي الصف الأول.

(لا بتدرتموه) أي سبقتم إليه.

(وإن صلاة الرجل مع الرجل أزكى) أي أكثر ثوابا (من صلاته وحده). عون المعبود شرح سنن أبي داود ج٢ ص١٨٢.

**واتــە: ئوبــەی كــوڕی كعــب ووتــی پێغەمبــەر (ﷺ) ڕۆژێــك نوێــژی بــەیانی پــێ دەكردین فەرمووی ئایا فلان هاتییە، ووتیان نــەخێر، ووتــی فــلان هاتییــە، ووتیــان نەخێر، فەرمووی ئەم دوو نوێژە (واتــە نوێــژی شــێوان و بــەیانی) گــرانترین نوێــژە لەسەر دووڕووەكان (منافق)، ئەگەر بیانزانیبایە كە چ خێروچاكەیان تێدایــە ئــەوە لەسەر دەستوچۆكان (وەك منــداڵی بــچووك چۆن لەســەر دەسـتو چۆك دەڕوات) دەهاتن (بۆ مزگەوت)، وە ڕیزی یەكەم وەكو ڕیزی فریشتەكانە وە ئەگەر زانیباتان**

چ خێری تێدایە زوو دەهاتن (واتە بۆ نوێژی بەکۆمەڵ (جماعە)، وە نوێژکردنی پیاوێك لەگەڵ پیاوێك خێری زیاترە لە تەنیایی، وە نوێژکردن لەگەڵ دوو پیاو خێری زیاترە لەگەڵ یەك پیاو، هەرچەندە زۆر بێت ئەوە لای خوای گەورە خۆشەویسترە).

۞عن ابْنُ حَزْمٍ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأَبَا حَيَّةَ الْأَنْصَارِيَّ كَانَا يَقُولَانِ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثُمَّ عُرِجَ بِي حَتَّى ظَهَرْتُ لِمُسْتَوًى أَسْمَعُ صَرِيفَ الْأَقْلَامِ قَالَ ابْنُ حَزْمٍ وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَفَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ خَمْسِينَ صَلَاةً فَرَجَعْتُ بِذَلِكَ حَتَّى أَمُرَّ بِمُوسَى فَقَالَ مُوسَى مَا الَّذِي فَرَضَ عَلَى أُمَّتِكَ قُلْتُ فَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسِينَ صَلَاةً قَالَ فَرَاجِعْ رَبَّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ فَرَجَعْتُ فَرَاجَعْتُ رَبِّي فَوَضَعَ شَطْرَهَا فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ فَذَكَرَ مِثْلَهُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ فَإِنَّ أُمَّتَكَ لَا تُطِيقُ ذَلِكَ فَرَجَعْتُ فَرَاجَعْتُ رَبِّي فَقَالَ هِيَ خَمْسٌ وَهِيَ خَمْسُونَ لَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ.. ..... رواه البخاري (٣٣٤٢).

معاني بعض الكلمات:

(فوضع شطرها) يعني بعضها.

( اسمع فيه صريف الأقلام ) بفتح الصاد المهملة تصويت أقلام الملائكة بما يكتبونه.

التيسير بشرح الجامع الصغير ج٢ ص٢٥٤.

**واتە: لەم فەرموودەیە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کاتی پێغەمبەرمان (ﷺ) بەرەو ئاسمان میعراجی پێکرا، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێ منیان بەرز کردەوە ئاسمان گەیش[illegible]ەو ئاستەی کە گوێم لە دەنگی پێنووس بوو کاتێ(فریشتەکان) پێیان دەنووسیێ ئینجا خوای گەورە (پەنجا) نوێژی لە ڕۆژێکدا لەسەر فەرزکردم بەڵام کاتێ گەڕامەوە بەلای پێغەمبەر موسی (ﷺ) تێپەڕم، پێغەمبەر موسی**

(ﷺ) پێی فەرمووم ئـەوە چ لەسـەرئومەتەکەت فـەڕزکراوە پـێم فـەرموو (پـەنجا) نوێژ فەڕزکراوە فـەرمووی بگـەڕێوە لای پـەروردەگارت ئومەتەکـەت نـاتوانن ئەمـە ئەنجام بدەن (واتە پەنجا نوێژبکەن لە ڕۆژێکدا) منیش گەڕامەوە لای پەروەردگارم داوام لێکرد هەندێکی لادا، ئینجا گەڕامەوە لای موسی (ﷺ) پێ فەرمووم بگەڕێوە لای پەروردگارت (واتە ئومەتەکەت ناتوانن ئەمـە ئـەنجام بـدەن) ئینجـا گەڕامـەوە لای پەروەردگارم داوام لێکرد خوای گەورە هەندێکی تریشی لادا ئینجـا گەڕامـەوە لای موسی (ﷺ) پێم ووت فەرمووی بگەڕێوە لای پەروردگارت ئومەتەکەت ناتوانن ئەمە ئەنجام بـدەن منـیش گەڕامـەوە لای پـەروەردگارم داوام لێکـرد پـەروەدگارم فەرمووی ئەوە (پێنج)، بەڵام (پەنجایە) (واتە خوای گەورە فەرمووی پێـنج نوێـژە بەڵام خێری پەنجا نوێژتان بۆ حیساب دەکـەم) (خـوای گـەورە فـەرمووی) ووتـەی من ناگۆڕدرێـت تـازە بۆتـان نووسـراوە (واتـە هـەر نوێـژێك یـەك بـە (دە) حیساب دەکات).

نوێژ لـە مزگـەوت خێـری یـەك بـە (٢٥ یـان٢٧) نوێـژ هەیـە لـەوەی لـە ماڵـەوە دەکرێت هەروەك لە فەرموودەی پێشتر باسمان کردووە:

| |
|---|
| ٢٥× ٥ = ١٢٥ نوێژ لە ڕۆژێکدا وە هەر نوێژەکیش یەك بە (دە)یە کەوا بوو<br>١٢٥ × ١٠ = ١٢٥٠ نوێژ دەکات: خوای گەورە فەرمووی پێنج بەڵام پەنجایە<br>١٢٥٠ × ٥٠ = ٦٢٥٠٠ نوێژ دەکات ئەگەر لە مزگەوت بێ |
| ٦٢٥٠٠ ×٣٠ = ١٨٧٥٠٠٠ نوێژ لە مانگێك |
| ١٨٧٥٠٠٠ × ١٢= ٢٢٥٠٠٠٠٠ نوێژ لە ساڵێك |
| ٢٢٥٠٠٠٠٠ ×٢٠ = ٤٥٠٠٠٠٠٠٠ نوێژ لە ٢٠ ساڵ |

جا ئەگەر ٤٥٠٠٠٠٠٠٠ دابەشی ٣٥٠ ڕۆژ بکەین کە دەکات ساڵێك بە ساڵی کۆچی ئەنجامەکەی دەکاتە:

٤٥٠٠٠٠٠٠٠ ÷ ٣٥٠ = ١٢٨٥٧١٤,٢سالْ نوێژ دەكات ئایا كەس هەیە ئەم چاكەی بزانی لە دەستی خۆی بدات؟.

ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر دەتەوێت درودو ڕەحمەتی خوای گەورە بەدەست بێنی دەبێت ئەو داوایانەی كە پێغەمبەر (ﷺ) كردویەتی جێ بەجێ بكەین بە داخەوە زۆر جار دەبینین كەسانێك هەن پێیان ناخۆشە ئەگەر داوای ئەوەیان لێبكەی كە ڕیز ڕاست بكەن یا كەلێن نەهێڵنەوە لە نیوانیان، بەلاّم دەبی ئەوە بزانین كە ئەمە داوای پێغەمبەرمانە (ﷺ) كە خۆشەویسترین كەسی خوای گەورەیە جا توخوا چۆن سوننەتەكانی جێ بەجێ نەكەین!!!.

۞عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ثَائِرَ الرَّأْسِ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ الصَّلَاةِ فَقَالَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا فَقَالَ أَخْبِرْنِي بِمَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ الصِّيَامِ قَالَ شَهْرَ رَمَضَانَ إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ شَيْئًا قَالَ أَخْبِرْنِي بِمَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ الزَّكَاةِ قَالَ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ قَالَ وَالَّذِي أَكْرَمَكَ لَا أَتَطَوَّعُ شَيْئًا وَلَا أَنْقُصُ مِمَّا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ شَيْئًا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ أَوْ دَخَلَ الْجَنَّةَ إِنْ صَدَقَ. رواه البخاري (٦٩٥٦).

واتە: پیاوێكی (ئەعرابی)هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) خوای گەورە چی لەسەر فەرز كردووم لە نوێژ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پێنج نوێژ لە ڕۆژێكدا فەرزكراوە وەئەگەر هەندێكی تر بۆ خوا بكەی (واتە وەك سوننەتەكانی پێش وپاشی نوێژەكان)، ووتی پێم بڵێ خوای گەورە چی لەسەر فەرز كردووم لە ڕۆژو، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی مانگی ڕەمەزان وەئەگەر هەندێكی تر بۆ خوا بەڕۆژو بیت (واتە وەك سوننەتەكانی ڕۆژو وەك شەش ڕۆژ لە

مانگی شوال دووشەمەوپێنج شەمە....هتد لە بەڕۆژو بوونی سوننەتەکانی تر کە هەیە)، ووتی خوای گەورە چی لەسەر فەرز کردووم لە زەکات، جا پێغەمبەر (ﷺ) پێ فەرمووی لەسەر بنجینەکانی ئیسلام (واتە ئەو شتانەی کە زەکاتی لەسەرە وەك زێڕوزیو گەنموجۆ.. ...هتد،جا چۆنیەتی زەکات دان باس کراوە لە کتابەکانی فقهی ئیسلامی ئەگەر دەتەویت بزانی)، ووتی سوێندبێ بەو خوایەی کە ڕێزی لێناوی هیچ زیاد ناکەم وە هیچ کەم ناکەم لەسەرئەوەی کە لەسەرم فەرزکراوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی سەرکەوتووبوو ئەگەر ڕاست بکات یاخود دەچێتە بەهەشت ئەگەر ڕاست بکات.

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ صَلَّى لِلَّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا فِي جَمَاعَةٍ يُدْرِكُ التَّكْبِيرَةَ الْأُولَى كُتِبَتْ لَهُ بَرَاءَتَانِ بَرَاءَةٌ مِنْ النَّارِ وَبَرَاءَةٌ مِنْ النِّفَاقِ. رواه الترمذي (٢٤١) و الشهاب في مسنده (٤٦٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك چل ڕۆژ نوێژەکانی بە کۆمەڵ (واتە بە (جماعە) لە مزگەوت) بکات دوا نەکەوێت لە الله اکبری یەکەم (واتە لەگەڵ ئیمام لە ڕەکعەتی یەکەم نیەتی بینی) ئەوە دوو پاکانەی لە سەر دەنووسرێت، پاکانەك لە ئاگری دۆزەخ وە پاکانەك لە دووڕوویی، کەوابوو ئەو کەسەی کە بەردەوام دەچێ بۆ مزگەوت پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرموودەیەکی تر دەفەرمووی:

۞قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَنَّهُ قَالَ إِذَا رَأَيْتُمْ الرَّجُلَ يَعْتَادُ الْمَسْجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالْإِيمَانِ فَإِنَّ اللَّهَ قَالَ { إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللَّهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ}.
رواه احمد (١١٧٢٥) والترمذي (٢٦١٧). وقال الترمذي حسن غريب، وصححه ابنا خزيمة وحبان والحاكم, ينظر في كتاب كشف الخفاء ج١ ص٩٠.

**واتە: ئەگەر پیاوێکتان بینی بە بەردەوامی دەچێت بۆ مزگەوت ئەوە شایەدی ئیمانی بۆ بدەن، وەهەروەها خوای گەورەش بە ئایەتێك ئامـاژە بـۆ ئـەو کەسانە دەکات کە مزگەوت ئاوەدان دەکەنەوە دەفەرمووێت:** فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: (إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللهِ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَاليَوْمِ الآخِرِ) (التوبة: الآيَةَ ١٧). تفسير بن كثير ج ٢ ص ٤١٥.

**واتـە: بەڕاستی ئـەو کەسـەی مزگـەوت ئـاوەدان دەکاتـەوە کەسێکە بـڕوای هێنابێت بەخوای گەورە (واتە خاوەن ئیمانە) وە بەڕۆژی دوایی.**

**جا (ابن کثیر) لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێ ئەمە شایەدی خـوای گەورەیـە بـە ئیمان بۆ ئەو کەسەی کە بە بەردەوام مزگەوت ئاوەدان دەکاتەوە بە خواپەرستی.**

*بين في هذه الآية من هو المستحق لعمارة المساجد وهو من آمن بالله فإن الإيمان بالله شرط فيمن يعمر المسجد. تفسير الخازن ج ٣ ص ٦٨.

**هەروەها لە (تفسیر الخازن )یشدا لە بارەی ئەم ئایەتە دەڵێ مەرجی ئیمـان بـە خوای گەورە ئەوەیە کە کەسێك مزگەوت ئاوەدان بکاتەوە، کـەوابوو ئـەو کەسـەی مزگەوت ئاوەدان دەکاتەوە خاوەن ئیمانە خوای گـەورە لـەو کەسـانەمان حیساب بکات ئامین.**

۞عَنْ أَبَا عَمْرٍو الشَّيْبَانِيَّ يَقُولُ أَخْبَرَنَا صَاحِبُ هَذِهِ الدَّارِ وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى دَارِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ قَالَ الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا قَالَ

ثُمَّ أَيٌّ قَالَ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ قَالَ ثُمَّ أَيٌّ قَالَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. رواه البخاري (٥٩٧٠) و مسلم (٢٦٢).

واتە: عبداللەی کوڕی مسعود ووتی پرسیارم لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد باشترین کار چیە فەرمووی (نوێژە لە کاتی خۆی بکرێت) ووتی چی تر فەرمووی (چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك) ووتی چی تر فەرمووی (جیهاد کردن لە پێناوی خوای گەورە).

## خێری تەواو کردنی ڕیزی نوێژ

۞عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ سَدَّ فُرْجَةً فِي الصَّفِّ غُفِرَ لَهُ ». رواه البزار (٤٢٣٢): قَالَ. إِسْنَادُهُ حَسَنٌ.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەر یەکێك کەلێنی ڕیزیك لە نوێژ پڕکاتەوە خوای گەورە لێی خۆش دەبێت.**

۞عَنْ ابْنَ عُمَرَ - أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « وَلاَ تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ وَمَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ ». رواه أبو داود (٦٦٦) و النسائي (٨١٩) و ابن خزيمة في صحيحه (١٥٤٩).

معاني بعض الكلمات:

(ومن وصل صفاً) بوقوفه فيه (وصله اللّه) برحمته ورفع درجته.

(ومن قطع صفاً) بأن ترك بينه وبين من بالصف فرجة بلا حاجة (قطعه اللّه) أي أبعده من ثوابه ومزيد رحمته.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی کەلێن مەهێڵنەوە لەبۆ شەیتان وەهەرکەسێك ڕیزێك پڕکاتەوە ئەوە خوای گەورە ڕەحمی خۆی پێدەگەێنی (وە پلەی بەرز دەکاتەوە)، وەهەرکەسێك ڕیزێك ببڕی (واتە کەلێن بەجێ بێڵی بەبێ هۆ**

ئەوە خوای گەورە لە ڕەحمو پاداشتی خۆی دووری دەخاتەوە خوای گەورە پەنامان بدات لەو کارە ناڕەوایە ئامین).

۞عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَعَلَى الثَّانِي قَالَ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصَّفِّ الْأَوَّلِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَعَلَى الثَّانِي قَالَ وَعَلَى الثَّانِي قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَوُّوا صُفُوفَكُمْ وَحَاذُوا بَيْنَ مَنَاكِبِكُمْ وَلِينُوا فِي أَيْدِي إِخْوَانِكُمْ وَسُدُّوا الْخَلَلَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ بَيْنَكُمْ بِمَنْزِلَةِ الْحَذَفِ). يَعْنِي أَوْلَادَ الضَّأْنِ الصِّغَارَ. رواه أحمد بن حنبل (٢٢٢٦٣).

قَوْلُهُ: «وَلِينُوا فِي أَيْدِي إِخْوَانِكُمْ» أَيْ إِذَا جَاءَ الْمُصَلِّي وَوَضَعَ يَده عَلَى مَنْكِب الْمُصَلِّي فَلْيَلِنْ لَهُ بِمَنْكِبِهِ، وَكَذَا إِذَا أَمَرَهُ مَنْ يُسَوِّي الصُّفُوفَ بِالْإِشَارَةِ بِيَدِهِ أَنْ يَسْتَوِيَ فِي الصَّفّ أَوْ وَضَعَ يَده عَلَى مَنْكِبه فَلْيَسْتَوِ، وَكَذَا إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْخُل فِي الصَّفّ فَلْيُوسِعْ لَهُ.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە لەگەڵ فریشتەکانی درودو ڕەحمەت لە سەر ڕیزی یەکەم لێدەدەن (واتە لە کاتی نوێژی بە جەماعەت دەکرێت لە مزگەوت) ووتیان لەسەر ڕیزی دووەمیش ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)؟ فەرمووی خوای گەورە لەگەڵ فریشتەکانی درودو ڕەحمەت لە سەر ڕیزی یەکەم لێدەدەن، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ریزی دووەمیش؟ فەرمووی لەسەر ڕیزی دووەمیش، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ڕیزەکانتان ڕاست بکەن شانتان پێك بدەن (ولینو فی ایدی اخوانکم) (واتە دەبێت نەرم و نیان بن کاتی یەکێك بە دەست لە شانتی دا ویستی پێت بڵێ ڕیزەکە ڕاست بکە یاخود بە ئیشارەت پێت بڵێ بۆشایی مەهێڵەوە یان ویستی بێتە نێوانتان جێگای بۆ بکەوە) وە کەلێن لە نێوان خۆتان مەهێڵنەوە چونکە شەیتان دێتە نێوانتان وەك بەرخۆڵە (واتە هاتوو چوو دەکات وە بیرو هۆشتان لە سەر نوێژ لا دەبات).

## خێرى ووتنى ئامين لەگەڵ پێش نوێژ لە نوێژى بە کۆمەڵدا

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذَا قَالَ الْإِمَامُ {غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ} فَقُولُوا آمِينَ فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رواه البخاري (٧٨٠).

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموويەتى ئەگەر پێش نوێژ (الامام) ووتى (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ) بڵێن ئامين ئەگەر هەر يەكێك لە ئێوە ووتنەكەى لەگەڵ ئيمام و فريشتەكان يەك بوو ئەوە گوناهەكانى پێشووى هەموو دەسڕێتەوە.

## خێرى ووتنى ( سمع الله لمن حمده ) لە نوێژى بە کۆمەڵدا

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِذَا قَالَ الْإِمَامُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقُولُوا اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رواه البخاري (٧٩٦) وغيره.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى ئەگەر (ئيمام) پێش نوێژ ووتى (سمع الله لمن حمدة) ئێوەش بڵێن (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ) ئەگەر هەر يەكێك ووتنەكەى لەگەڵ ووتنى فريشتەكان يەك بوو خواى گەورە لە گوناهەكانى پێشووى خۆش دەبێ.

## خێرى نوێژى بەيانى و عەسر

۞عَنْ أَبِي بَكْرٍ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ ». رواه البخاري (٥٧٤) و مسلم (١٤٧٠).

البردان: الفجر والعصر

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى هەر يەكێك (نوێژى بەيانى و عصر بكات) دەچێتە بەهەشت.

## خێری سوننەتی پێش نوێژی بەیانی

۞عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا ». رواه مسلم (١٧٢١) و الترمذي (٤١٦) وغيرهما.

معاني بعض الكلمات:

(ركعتا الفجر) يعني: ركعتان قبل صلاة الفجر. فقه العبادات حنفي ج١ ص١٨٧.

(وما فيها) أي: ما في الدنيا من المال والأهل والبنين وغيرها من زينة الدنيا وزهرتها.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی دوو ڕەکعەت (واتە سوننەتی پێش) نوێژی بەیانی خێری لە دونیاو وە ئەوەی کە تێدایە زیاترە (واتە خێری لە هەموو سەروەت و سامان و منداڵ و باغ و باغاتی دونیا.. .هتد زیاترە) جا لە دایکی ئیمانداران دەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) هیچ سوننەتێك وەك سوننەتی پێش نوێژی بەیانی پابەند نەبووە هەر وەك دەفەرمووی:**

۞عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ لَمْ يَكُنْ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى شَيْءٍ مِنْ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مِنْهُ تَعَاهُدًا عَلَى رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ. رواه البخاري (١١٦٩).

**وەهەروەها ئیمام مالك لە مختصر باس لە سوننەتی پێش نوێژی بەیانی دەکات:**

قال مالك فى المختصر: ليستا بسُنَّة، وقد عمل بها المسلمون فلا ينبغى تركها. شرح صحيح البخارى. لابن بطال ج٣ ص ١٥٨.

**ئیمام مالك ڕای وایە لە سوننەت زیاترە نابێ تەرك بکرێت چونکە موسڵمانان کاریان پێکردووە (واتە لە سوننەت زیاتر بایەخیان پێ داوە).**

وذهبت طائفة من العلماء إلى أنهما سُنَّة، هذا قول الشافعى، وأحمد، وإسحاق، وغيرهم. شرح صحيح البخارى. لابن بطال ج٣ ص ١٥٨.

بەلام کۆمەڵە زانایەك دەڵێن ئەمە سوننەتە وەك ئیمام (الشافعي، وأحمد، وإسحاق).

جا موسڵمانی بەڕێز پاش ئەوەی زانیمان کە ئەم دوو ڕەکعەتە ئەوەندە خێرە توخوا تاوان نیە ئەگەر نەکەین؟؟؟.

۞عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي مِنْ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً فَإِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ حَتَّى يَجِيءَ الْمُؤَذِّنُ فَيُؤْذِنَهُ. رواه البخاري (٦٣١٠) و مسلم (١٧٥٢).

معاني بعض الكلمات:

(ركعتي الفجر) أي سنة الفجر.

(اضطجع) في منزله وليس بين المصلين في المسجد. الجامع الصحيح المختصر ج ١ ص ٣٨٩.

(فيؤذنه) يعلمه بإقامة الصلاة.

واتە: دایکی ئیمانداران دەفەرمووێ بەشەو پێغەمبەر (ﷺ) یانزدە ڕەکعەت نوێژی دەکرد وە کاتی بەیانی دەدا دوو ڕەکعەتی بە سوکی دەکرد لە دوایدا لەسەر لای ڕاستە پاڵی دەداوە (وەك چۆن مردوو دەنێژرێ، وە دەبێ ڕووت لە قیبلە بێت کاتی پاڵ دانەوە) هەتا بانگدەر بۆ نوێژی بەیانی ئاگاداری دەکردەوە.

**بەلام بە داخەوە زۆربەی هەر زۆری ئەو سوننەتە هەر نازانن.**

## خێری پاڕانەوە لە کاتی کڕنۆش ( سجدە ) بردن

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ ». رواه مسلم (١١١١).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی بەندە ئەو کاتە زۆر لە خوای گەورە نزیک دەبێتەوە کاتێك لە سجدە (کڕنوش )دایە جا دوعا زۆر بکەن.**

**پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کاتی سجدە(کڕنوش) ئەم دوعایەی دەکرد** (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ، دِقَّهُ وَجِلَّهُ، وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ، وَعَلانِيَتَهُ وَسِرَّهُ). رواه مسلم (١١١٢).

**واتە: خوایە لە هەموو گوناهەکانم خۆش بە، بچووك وگەورە، وە لە سەرەتا و کۆتایی، ئەوەی بەئاشکرا و نهێنی کردومە.**

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم « إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِى يَقُولُ يَا وَيْلَهُ - وَفِى رِوَايَةِ أَبِى كُرَيْبٍ يَا وَيْلِى - أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِىَ النَّارُ ». رواه مسلم (**254**).

معاني بعض الكلمات:

(إذا قرأ ابن آدم السجدة) أي آيتها (فسجد) سجود التلاوة.

(اعتزل) أي تباعد عنه (الشيطان) إبليس.

(يا ويله) أي يا حزني ويا هلاكي. التيسير بشرح الجامع الصغير ج ١ ص ٢٤٠.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی کاتێ نەوەی ئادەم ئایەتی (سجدە )ی خوێندەوە لە قورئان (واتە شوێنی سەجدە بردن و سەجدەی برد) شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوە و دەست بە گریان دەکات و دەڵێت (یاویلە) (واتە وای لەم هەلاك و خەم و پەژارە کە توشی بووم) فەرمان بە نەوەی ئادەم کرا بە سەجدە**

بردن سەجدەی برد بەهەشتی بۆ بوو، وە منیش فەرمانم پێکرا بە سەجدە بردن بەلاّم سجدەم نەبرد جا دۆزەخم بۆ بوو.

موسلّمانی بەڕێز :- بزانە ئەوانەی سەجدە دەبەن لە کاتی نوێژ و قورئان خوێندن ئەوە بەهەشت بەدەست دێنن، بەلاّم خوا نەخواستە ئەوانی سەجدە بۆ خوا نەبەن ئەوا دۆزەخ شوێنیانە، خوای گەورە پەنامان بدا.

۞عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: "مَا مِنْ عَبْدٍ يَسْجُدُ فَيَقُولُ رَبِّ اغْفِرْ لِي ثَلاثَ مَرَّاتٍ، إِلا غُفِرَ لَهُ قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ".رواه الطبراني في الكبير (٨١٩٧). وينظر:في كتاب كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال (٢٠٩١) و مجمع الزوائد ومنبع الفوائد ج٢ ص ١٥٣ و الفتح الكبير في ضم الزيادة إلى الجامع الصغير ج٣ ص ١٠٩.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر بەندەیێك سجدەی برد ئینجا (سێ) جاران ووتی (رَبِّ اغْفِرْ لِي) (واتە ئەی پەروەردگارە لێم خۆشبە بەلاّم ئاگاداربە لە سجدە نابێ بە کوردی ئەم دوعایەی بکەی). ئەوە بەدڵنیایی خوای گەورە لێیخۆش دەبێت پێش ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە (واتە لە سجدە).

## خێری نوێژی ئیستخارە

﴿عَنْ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ السَّلَمِيُّ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَلِّمُ أَصْحَابَهُ الِاسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُهُمْ السُّورَةَ مِنْ الْقُرْآنِ يَقُولُ إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ لِيَقُلْ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هَذَا الْأَمْرَ ثُمَّ تُسَمِّيهِ بِعَيْنِهِ خَيْرًا لِي فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ قَالَ أَوْ فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ اللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّهُ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ رَضِّنِي بِهِ. رواه البخاري (٧٣٩٠).

**واتە: جابر کوڕی عبداللە دەفەرموێ پێغەمبەرمان (ﷺ) هاوەڵەکانی فێری نوێژی ئیستخارە دەکردن بۆ هەموو کارێکی چاك هەروەك فێری سورەتێکی لە قورئان دەکردن، دەیفەرموو ئەگەر ویستان کارێك بکەن ئەوە دوو ڕەکەعەت نوێژ بکەن جگە لە فەرزەکان، واتە هەر کەسێك دوو دڵ بوو لە ئەنجام دانی هەرکارێك ئایا ئەم کارە حەڵاڵە یان نا یا بۆ هەر کارێکی باش با دوو ڕەکعەت سوننەت بکا، بە نیەتی (صَلاةُالإسْتِخَارَة )، ئینجا لە دوای سەلامدانەوە، ئەم دوعایە بکا** ﴿أَللَّهُمَّ إِنِّ أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، أَللَّهُمَّ إنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذاالأَمْرَ(...) خَيْرٌ لِى فِى دِينِى وَدُنْيايَ وَمَعاشِى وَعاقِبَةِ أَمْرِى -عاجِلِهِ وَآجِلِه- فَاقْدُرْهُ لِى وَيَسِّرْهُ لِى ثُمَّ بارِكْ لِى فِيهِ، أَللَّهُمَّ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هذا الأَمْرَ(...) شَرٌّ لِى فِى دِينِى وَدُنْيايَ وَمَعاشِى وَعاقبةِ أَمْرِى -عاجِلِهِ وَآجِلِهِ- فَاصْرِفْهُ عَنِّى وَاصْرِفْنِى عَنْهُ وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كانَ ثُمَّ أَرْضِنِى بِهِ﴾.

**ئاگاداری یەکەم: لە نێوان دوو کەوانەکاندا ناوی کارەکە بهێنە، جا لە دوای دووعایەکە دڵی بۆ کام لا ڕۆیشت ئەو لایە بکات جا ئەم نوێژە بۆ کردنی کاری (واجب) یان (سُنَّة) دەکرێت. حاشیة الجمل علی المنهج لشیخ الإسلام زکریا الأنصاري ج ٢ ص ٦٤٨.**

**ئاگاداری دووەم: بەڵام ئەگەر یەکێك ویستی کارێکی (حرام)، یان (مکرۆه) بکە، وەك (ریبا یا دروستکردنی دووکان بۆ عەرەق فرۆشتن.. .هتد) ئەم کارە خراپانە نوێژی (إستخارە) ی بۆ ناکرێ، هەروەك لە (فتح الباری) دا ڕوون کراوەتەوە لەبەشی دوعای (استخارە).**

**ئاگاداری سێ یەم: پێش ئەوەی ئەم نوێژە بکەی وا سوننەتە ڕاوبۆچوونی چەند موسڵمانێکی باش وەربگری ئینجا نوێژی** (إستخارة) بکات. حاشية الجمل على المنهج لشيخ الإسلام زكريا الأنصاري ج ٢ ص ٦٥١.

## خێری نوێژی (التسبيح)

۞عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ لِلْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ « يَا عَبَّاسُ يَا عَمَّاهُ أَلاَ أُعْطِيكَ أَلاَ أَمْنَحُكَ أَلاَ أَحْبُوكَ أَلاَ أَفْعَلُ بِكَ عَشْرَ خِصَالٍ إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِكَ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ ذَنْبَكَ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ قَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ خَطَأَهُ وَعَمْدَهُ صَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ سِرَّهُ وَعَلاَنِيَتَهُ عَشْرَ خِصَالٍ أَنْ تُصَلِّىَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِى كُلِّ رَكْعَةٍ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ وَسُورَةً فَإِذَا فَرَغْتَ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِى أَوَّلِ رَكْعَةٍ وَأَنْتَ قَائِمٌ قُلْتَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً ثُمَّ تَرْكَعُ فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ رَاكِعٌ عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ الرُّكُوعِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَهْوِى سَاجِدًا فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ سَاجِدٌ عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ فَتَقُولُهَا عَشْرًا فَذَلِكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ فِى كُلِّ رَكْعَةٍ تَفْعَلُ ذَلِكَ فِى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِى كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِى كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِى كُلِّ شَهْرٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِى كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِى عُمُرِكَ مَرَّةً ». رواه ابو داود (١٢٩٩) و ابن ماجه (١٣٨٧) والبيهقي في شعب الإيمان (٦١٠) وغيرهم.

معانى بعض الكلمات:

(أمنحك) بمعنى أعطيك، وكذا أحبوك، فهما تأكيد بعد تأكيد، وكذا أفعل لك فإنه بمعنى أعطيك أو أعلمك، (عشر خصال) منصوب، تنازعت فيه الأفعال قبله. والمراد بعشر خصال الأنواع العشرة للذنوب من الأول والآخر والقديم والحديث. أي فهو على حذف مضاف، أي ألا أعطيك مكفر عشرة أنواع ذنوبك، أو المراد التسبيحات فإنها فيما سوى القيام عشر عشر، وعلى هذا يراد الصلاة المشتملة على التسبيحات العشر بالنظر إلى غالب الأركان، وأما جملة إذا أنت فعلت الخ فهي في محل النصب على أنها نعت للمضاف المقدر على الأول، أو لنفس عشر خصال على الثاني. سنن ابن ماجه (١٣٨٧).

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) بە عباسی کوڕی عبدالمطلب فەرمووی ئەی عباس ئەی مامە ئایا (أَلاَ أُعْطِيكَ أَلاَ أَمْنَحُكَ أَلاَ أَحْبُوكَ أَلاَ أَفْعَلُ بِكَ) (ئەم ووشانە هەمووی بە مانای پێدان دێت، کە پێغەمبەرمان (ﷺ) مامی (ڕەزای خوای لێ بێت) دڵنیایی دەکردەوە) ئەگەر ئەم کارە ئەنجام بدەی دەبێتە سڕینەوەی (دە) شت خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانت خۆش دەبێت ئەوەی (لە یەکەمەوە تا کۆتایی، وە ئەوەی کۆنە و نوێیە، وە ئەوەی بە هەڵە یا بەڕاستی، وە ئەوەی بچووکە و گەورەیە، وە ئەوەی بەنهێنی و ئاشکرا) کە کردوتە لێت خۆش دەبێت بە کردنی ئەم (دە) شتە، هەر وەك لە خوارەوە باسیان دەکەین:

(صَلاَةُالتَّسْبِيحِ) ئەو نوێژە چوار ڕەکعەتە: بە یەك سەلام ئەگەر ڕۆژ بێت، یان بە دوو سەلام ئەگەر شەو بێت واتە بە دوو دوو ڕەکعەت دەکرێت، بە نیەتی (صَلاَةُالتَّسْبِيح) نوێژەکە دادەبەستێ، ئینجا لە دوای خوێندنی فاتیحەو سوڕەتێکی کورت (پانزە) جار دەڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ)، ئینجا لە ڕوکووعدا (دە) جاریتریش (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) دەیڵێ، ئینجا لە ڕوکووع هەڵدەستێتەوە (دە) جاریتر (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) دەیڵێ، ئینجا لە سوجدەی یەکەمدا (دە) جاریتر (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ

ولا إله إلاّ اللّهُ واللّهُ أكبَرُ) دەیڵێ‌و لە دانیشتنی نێوان سوجدەکاندا (دە) جار (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) دەیڵێ‌و لە سوجدەی دووەمدا (دە) جار (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) دەیڵێ‌و لە دوای سوجدەی دووەم بۆ (جِلْسَةُ الإِسْتِرَاحَة)، یان بۆ تەحیات دادەنیشێ و (دە) جار (سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) دەیڵێ، ئەوە دەکاتە حەفتاو پێنج، ئینجا هەڵدەستێتەوەو لە ڕەکعەتی دووەم و سێ یەم و چوارەم بە هەمان ژمارە دەیڵێتەوە، تا (سێ سەد) جار تەواو دەبێ، هەروەها بە شێوەیەکی تریش دروستە: وەك لە پێش فاتیحەدا (پانزە) جار بڵێ و لە دوای فاتیحەو سورەتیش (دە) جار، واتە: لە دوای سوجدەی دووەم لە (جِلْسَةُ الإِسْتِرَاحَة) دا هیچ جارێك نەیڵێ. مغنی المحتاج ج١ ص ٢٢٥.

## خێری نوێژی هەینی (جمعة) وە ئەوەی لەو ڕۆژەشدا ئەنجامدەدرێت

۞عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ قُبِضَ وَفِيهِ النَّفْخَةُ وَفِيهِ الصَّعْقَةُ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنْ الصَّلَاةِ فِيهِ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ تُعْرَضُ عَلَيْكَ صَلَاتُنَا وَقَدْ أَرِمْتَ يَعْنِي وَقَدْ بَلِيتَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ. رواه احمد (١٦١٦٢) و سنن ابن ماجه (١٠٨٥).

شرح بعض الكلمات :

(أرمت): بليت

وقال ابنُ بَرّيّ: (الصّعْقَةُ): الصّوتُ الذي يكونُ عن الصّاعِقَة.

تاج العروس من جواهر القاموس: ج ٢٦ ص ٢٢.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ (باشترین ڕۆژتان ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژە ئادەم دروست بووە، وە لەو ڕۆژە گیانی سپاردوە، وە لەو ڕۆژەش نەفخی

سور لێدەدرێت، وە لەو ڕۆژە دەنگێکی زۆر بەهێز دێت (جا بە هۆی ئەو دەنگە زەوی و ئاسمانەکان تێك دەچن)، جا لەو ڕۆژە زۆر صەڵاواتم لە سەر لێ بدەن، چونکە صەڵاواتان پێم ڕادەگێندرێت، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن پێت ڕادەگێندرێت، لەبەر ئەوەی بوویەوە خۆڵ؟ پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرمووی خوای گەورە حەرامی کردووە کە زەوی لاشەی پێغەمبەران (صلوات الله عليهم وسلامه ) (تێك بدات لەبەر ئەوەی خوای گەورە ڕێزی لێناون).

۞عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ - صلى الله عليه وسلم - « إِنَّ فِى الْجُمُعَةِ لَسَاعَةً لاَ يُوَافِقُهَا مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّى يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ ». رواه مسلم (٢٠٠٧).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی (لە ڕۆژی هەینی (جمعة) کاتێك هەیە هەر موسڵمانێك نوێژ بکا وە داوای خێرو چاکە بکات لە خوای گەورە، هاوکاتبێت لەگەڵ ئەم کاتە بەدڵنیایی خوای گەورە پێ دەبەخشی).**

۞عَنْ أَبِى بُرْدَةَ بْنِ أَبِى مُوسَى الأَشْعَرِىِّ قَالَ قَالَ لِى عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فِى شَأْنِ سَاعَةِ الْجُمُعَةِ قَالَ قُلْتُ نَعَمْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « هِىَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلاَةُ ». رواه مسلم (٢٠١٢).

**واتە: لە عبدالله کوڕی عومەریان پرسی: ئایا گوێت لە باوکت بووە لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) باسی ئەو کاتەی بکات کە لە ڕۆژی هەینی (جمعة)دا هەیە (واتە دوعا گیرا دەبێت)؟ ووتی ووتم بەڵێ گوێم لێ بوو دەیفەرموو گوێم لە پێغەمبەر(ﷺ) بوو دەیفەرموو (ئەو کاتە لە نێوان دانیشتنی ئیمامە (لەسەر مینبەر) تا تەواو بوونی نوێژە).**

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَوْ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِلَّا وَقَاهُ اللَّهُ فِتْنَةَ الْقَبْرِ. رواه الترمذي (١٠٤٧) و أحمد (٦٥٨٢). حديث حسن.

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ (هەر موسڵمانێك لە ڕۆژی هەینی (جمعة) یا شەوی هەینی (جمعة) بمرێت ئەوە خوای گەورە لە ناخۆشیەکانی ناوگۆڕ دەیپارێزێت).**

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - يَقُولُ « إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْتِيَ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ ». رواه مسلم (١٩٨٨).

**واتە: پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرمووێ (ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێت بۆ مزگەوت با خۆی بشوات).**

۞عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ. رواه البخاري (٨٧٩).

**واتە: پێغەمبەرمان(ﷺ) دەفەرمووێ غوسل کردن لە ڕۆژی هەینی (جمعة) واجبە لە سەر هەموو باڵغێك).**

۞عَنْ سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ رضي الله عنه قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَتَطَهَّرَ بِمَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ ثُمَّ ادَّهَنَ أَوْ مَسَّ مِنْ طِيبٍ ثُمَّ رَاحَ فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ فَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ ثُمَّ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ أَنْصَتَ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى. رواه البخاري (٩١٠).

معاني بعض الكلمات:

(فلم يفرق بين اثنين) لم يجلس بينهما ولم يتخطاهما.

(ما بينه وبين الجمعة الأخرى) من يوم الجمعة إلى يوم الجمعة التي بعدها؟ التيسير بشرح الجامع الصغير ج ١ ص ٨٠٤.

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی (هەر یەکێك غوسلی هەینی (جمعة)ی کرد، وە خۆی پاککردەوە بە گوێرەی توانا، وەك نینۆك کردن و سمێڵ کورتکردن... هتد وە جوانترین پۆشاکی لەبەر کرد) وە خۆی چەوەرکرد (واتە: سەرو ڕیشی) وە خۆی بۆن خۆشکرد ئینجا چوو بۆ نوێژی جومعە بەڵام دوو کەسی لێك نەکرد (واتە بچێت لەنێوان دوو کەس دابنیشێت کە جێگای نابێتەوە، دەبێتە ئەزیەت دانی خەڵکی، هەروەها بەسەریانیش تێپەڕ نەبێت) ئینجا نوێژی کرد ئەوەی کە خوای گەورە لەسەری نووسیبوو (چ واجب بێت یا سوننەت) ئینجا کاتی ئیمام چوو بۆ سەر مینبەر گوێی دایە ووتارەکە (واتە هیچ قسەی نەکرد) خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێت کە کردوویەتی لە نێوان دوو هەینی (جمعة)، واتە لە ڕۆژی هەینی (جمعة) تا هەینی (جمعة) لە دوای دێت.**

۞عَنْ ابي هُرَيْرَةَ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم- « إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلاَئِكَةٌ يَكْتُبُونَ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ وَمَثَلُ الْمُهَجِّرِ كَمَثَلِ الَّذِى يُهْدِى الْبَدَنَةَ ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى بَقَرَةً ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى الْكَبْشَ ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى الدَّجَاجَةَ ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى الْبَيْضَةَ ». رواه البخاري (٩٢٩) و مسلم (٢٠٢١) وغيرهما.

معاني بعض الكلمات:

(المهجر) المبكر إلى المسجد.

(يهدي) يقرب إلى الله تعالى.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی (ئەگەر هاتوو ڕۆژی هەینی (جمعە) بوو ئەوە لە پێش هەموو دەرگایەك لە دەرگاكانی مزگەوت فریشتە هەیە ناوەكان دەنووسن یەك لە دوای یەك (واتە ئەوانەی زوو دێن بۆ مزگەوت) جا ئەگەر ئیمام دانیشت ئەوە ناوە نووسراوەكان دەپێچنەوە (واتە لوول دەدەن) ئینجا دێن بۆ بیستنی یادی خوای گەورە (واتە ووتارو...هتد)، جا نمونەی ئەو كەسەی كە زووتر دێت بۆ مزگەوت وەك ئەوەیە ووشترێك بكاتە خێر، ئینجا ئەوەی لە دواتر دێت وەك ئەوەیە چێلێك بكاتە خێر، ئینجا ئەوەی لە دواتر دێت وەك ئەوەیە بەرانێك بكاتە، خێر ئینجا ئەوەی لە دواتر دێت وەك ئەوەیە مریشكێك بكاتە خێر، ئینجا ئەوەی لە دواتر دێت وەك ئەوەیە هێلكەیەك بكاتە خێر.

۞عَنْ أَوْسُ بْن أَوْسٍ الثَّقَفِيُّ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ «مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ وَدَنَا مِنَ الإِمَامِ فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا». رواه ابو داود (٣٤٥) و ابن حبان بترتيب ابن بلبان (٢٧٨١). و البيهقي في السنن الكبرى (٥٦٧٠). معاني بعض الكلمات:

(من غسل) روي مشددا ومخففا، قيل أي جامع امرأته قبل الخروج إلى الصلاة، لأنه أغض للبصر في الطريق، من غسل امرأته بالتشديد والتخفيف إذا جامعها،

(واغتسل) أي للجمعة،

(بكر) المشهور التشديد، ويجوز تخفيفه، والمعنى أي أتى الصلاة أول وقتها،

(وابتكر) أي أدرك أول الخطبة، (ولم يلغ) أي لم يتكلم فإن الكلام حال الخطبة لغو، أو استمع الخطبة ولم يشتغل بغيرها. سنن ابن ماجه) ١٠٨٧.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ (هەر یەکێك غوسل بکات لە ڕۆژی هەینی (جمعە)دا (واتە پاش جووت بوونی لەگەڵ خێزانی ئەگەر خێزانداربوو چونکە باشترە بۆ پاراستنی چاوەکانی لە نەزەر کاتێ دەچێت بۆ مزگەوت) وە خۆی شووشت (واتە غوسلی هەینی (جمعە)ی کرد)، ئینجا زوو چوو (بۆ مزگەوت) وە هەروەها بە ووتاری یەکەمیش ڕاگەیشت، وە بە پێ ڕۆیشت بە سەیارە و وولاغ نەچوو، ئینجا لە ئیمام نزیك بووەوە گوێ بیستی ووتارەکە بوو وە هیچ قسەی نەکرد (چونکە قسە کردن لە کاتی ووتار، خێری نوێژی هەینی (جمعە)ی بەرناکەوێت)، ئینجا بۆی هەیە لە هەر هەنگاوێك کە دەچێت بۆ مزگەوت بە باداشتی یەك ساڵ چاکە لە بەڕۆژو بوون و بەشەو هەڵسانەوە بۆ خوا پەرستن (واتە پاداشتەکەی وەك ئەوەیە کە کەسێك یەك ساڵ ڕۆژەکانی هەمووی بەڕۆژی بێ لەگەڵ شەوەکان هەمووی خواپەرستی بکات).

۞عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ ». رواه النسائي (١٦٥٦) و ابن داود (١٠٥٤) و ابن خزيمة (١٨٥٨).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك سێ جار نوێژی هەینی (جمعە)ی بەبێ هۆ نەکات خوای گەورە مۆری لەسەر دڵی دەدات (واتە دڵی دەبێتە دڵی دوو ڕوو (منافق) خوا پەنامانبدا ئامین).**

## خێری ڕۆژو گرتن

۞عن أبي هُرَيْرَةَ رضي اللَّهُ عنْهُ عن النَّبِيِّ صلّى اللَّهُ عليْهِ وسلّم قال من قام ليْلة الْقدْرِ إيمانًا واحْتِسابًا غُفِر لهُ ما تقدّم من ذنْبِه ومن صام رمضان إيمانًا واحْتِسابًا غُفِر لهُ ما تقدّم من ذنْبِه. رواه البخاري (١٩٠٩).

(إيمانا واحتسابا) مصدقا بثوابه مخلصا بقيامه.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك شەوی (ليلة القدر )زیندوو بکاتەوە بە باوەڕێکی تەواو لە ڕووی خوا پەرستی، وە بەهای وابێ کە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە وەهەروەها شەو نخونیەکەی تەنها مەبەستی خوای گەورە بێت، ئەوە خوای گەورە لە هەموو گوناهەکانی خۆش دەبێت، وە هەر یەکێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژو بوو بە باوەڕێکی تەواو وە بڕواشی وابێ کە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە (واتە بە ڕۆژەکەی بە ڕۆژو بێت وە بە شەویش عیبادەتی خوای گەورە بکا وەك سوننەتی تەراویح و خوێندنی قورئان و...هتد بەپێی توانا کە هەیەتی) خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

۞عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ رضى الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- سُئِلَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ فَقَالَ « يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ وَالْبَاقِيَةَ ». قَالَ وَسُئِلَ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ فَقَالَ « يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ ». رواه مسلم (٢٨٠٤ ).

(يُكَفِّرُ السَّنَةَ الْمَاضِيَةَ وَالْبَاقِيَةَ) يعني يغفر الصغائر المكتسبة فيها بمعنى أنه تعالى يحفظه أن يذنب فيها أو يعطى من الثواب ما يكون كفارة لذنوبها. التيسير بشرح الجامع الصغير ج٢ ص ٢٠٠.

واتە: پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا لە بارەی بەڕۆژوو بوونی ڕۆژی عەرەفەدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەبێتە کەفارەتی گوناهە (بچووکەکانی) ساڵی ڕابردوو وە ساڵی داهاتوو (واتە خوای گەورە پاداشتی زۆری پێدەدات دەبێتە کەفارەتی

دوو ساڵ)، وە پرسیار لە پێغەمبەر (ﷺ) کرا لە بەڕۆژوو بوون لە ڕۆژی عاشورە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (کەفارەتی گوناهی ساڵێکە).

لە فەرموودەکی تر هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی « لَئِنْ بَقِيتُ إِلَى قَابِلٍ لأَصُومَنَّ التَّاسِعَ ». رواه مسلم (٢٧٢٣).

واتای ئەوەیە ئەگەر خوا تەمەنی دام ساڵی دابێ نۆیەمیش بەڕۆژی دەبم تاکو وەك جولەکەکان نەبین بەس عاشورای بەڕۆژی بین.

۞عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ - رضى الله عنه - قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِى سَبِيلِ اللَّهِ إِلاَّ بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا ». رواه مسلم (٢٧٦٧).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر بەندەیەك ڕۆژێك بۆ خوای گەورە بە ڕۆژو بێت ئەوە بە دڵنیایی خوای گەورە لەبەر ئەو ڕۆژە حەفتا ساڵ ڕووی لە دۆزەخ دوور دەکاتەوە.

۞عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِمًا »، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضى الله عنه أَنَا، قَالَ « فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً »، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضى الله عنه أَنَا، قَالَ « فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِينًا »، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضى الله عنه أَنَا، قَالَ « فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا »، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رضى الله عنه أَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَا اجْتَمَعْنَ فِى امْرِئٍ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ ». رواه مسلم (٢٤٢١).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چ کەسێك لە ئێوە ئەوڕۆ بەڕۆژیە، ئەبوبکر ڕەزای خوای لێبی ووتی من، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی کێ لە ئێوە ئەوڕۆ لە دوای

جەنازە ڕۆيشتووە، ئەبوبكر ڕەزاى خواى لێبى ووتى من، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى كێ لە ئێوە ئەوڕۆ نانى بە هەژارێك داوە، ئەبوبكر ڕەزاى خواى لێبى ووتى من، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى كێ لە ئێوە ئەوڕۆ سەردانى نەخۆشێكى كردووە، ئەبوبكر ڕەزاى خواى لێبى ووتى من، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووى هەركەسێك ئەمانەى لێ بێتە جێ بە دڵنيايى دەچێتە بەهەشت.

## خێرى حەج و عومرە

۞عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ قَالَ قَالَتْ عَائِشَةُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ «مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ وَإِنَّهُ لَيَدْنُو ثُمَّ يُبَاهِى بِهِمُ الْمَلاَئِكَةَ فَيَقُولُ مَا أَرَادَ هَؤُلاَءِ ». رواه مسلم (٣٣٥٤).

معاني بعض الكلمات:

(وإنه) أي سبحانه وتعالى (ليدنو) قال المازري: أي تدنو رحمته وكرامته لا دنو مسافة ومماسة.

(ثم يباهي بهم) أي بالحجاج (الملائكة) قال بعضهم: أي يظهر على الملائكة فضل الحجاج وشرفهم.

(فيقول: ما أراد هؤلاء؟ ) قال القاري: أي أي شيء أراد هؤلاء حيث تركوا أهلهم وأوطانهم وصرفوا أموالهم وأتعبوا أبدانهم أي ما أرادوا إلا المغفرة والرضاء والقرب واللقاء. مشكاة المصابيح ج٩ ص٢٨٣.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى هيچ ڕۆژێك نيە وەك ڕۆژى عەرەفە كە خواى گەورە لەو ڕۆژە بەندەكانى زۆر ڕزگار دەكات لە ئاگرى دۆزەخ (جهنم)، وەهەروەها لەو ڕۆژە لەبەندەكانى نزيك دەبێتەوە (جا ئەم نزيك بوونەوە بە واتاى پێوانە(مسافە) نيە بەڵكو بە سۆزو ڕێزلێنانى خواى گەورە بۆ بەندەكانى كە بۆ حەج ئامادەبوونە) جا خواى گەورە ڕێزوبەهاى حاجيەكان بە فريشتەكان

• به کەمترین کات و کار بەرەو لێخۆشبوونی پەروەردگار

نیشاندەدات، دەفەرمووێ، ئەمانە بۆ داوای چ هاتوونە (واتە ماڵ ومنداڵیان و خاکیان بەچێ هێشتووە وە پارەیان سەرف کردووە خۆیان ماندوو کردوە تەنها بۆ لێخۆشبوونو ڕەزامەندی خوای گەورە نەبێت کەوابوو خوای گەورە لێیان قبووڵ دەکات وەهەروەها بۆ ئەو داوایەی کە بۆی هاتوونە).

## خێری یادکردنەوەی خوای گەورە

ئەم ئایەتانەی خوارەوە خوای گەورە باسی ئەو کەسانەمان بۆ دەکات کە یادی خوای گەورە دەکەن هەروەها پێغەمبەرمان (ﷺ) چەند فەرموودەی گران بەهای هەیە لەسەر ئەم یادکردنەوە:

وقال سبحانه: (فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ) [ البقرة: ١٥٢ ].

وقال تعالى: (...وَاذْكُرْ رَبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ) [آل عمران :٤١].

قال الله سبحانه: (وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) [ الأحزاب: ٣٥ ].

وقال سبحانه: (الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) [ الرعد: ٢٨ ].

قال تعالى: (الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ) [آل عمران: ١٩١].

۞ قَالَتْ عَائِشَةُ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ). رواه البخاري (٦٣٣).

قوله (يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ) أي في كل أوقاته متطهرا ومحدثا وجنبا وقائما وقاعدا ومضطجعا وماشيا. تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ج ٩ ص ٢٣٠.

واتە: دایکی ئیمانداران عائیشە ڕەزای خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەموو کاتێ یادی خوای دەکرد (واتە هەموو کاتی دەست نوێژی هەبا یا نا، یا غوسلی لەسەر با یا نا، یا لە ڕاوەستان، یا لە دانیشتن، یا لە پاڵکەوتن، یا لە ڕۆیشتن).

۞عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ ". رواه البخاري (٦٤٠٧).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی نموونەی ئەو کەسەی کە یادی خوای گەورە دەکات لە گەڵ ئەو کەسەی کە یادی خوای گەورە ناکات وەکو نموونەی زیندو ومردوو وایە (واتە ئەو کەسەی کە یادی خوای گەورە ناکات دڵی مردووە خوای گەورە لەو کەسانەمان نەژمێرێت ئامین).

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي فَإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ بَاعًا وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً. رواه البخاري (٧٤٠٥).

قال القاضي مَعْنَى (ظَنّ عَبْدِي بِي) أَيْ: ظَنُّ الْإِجَابَة عِنْد الدُّعَاء، وَظَنّ الْقَبُول عِنْد التَّوْبَة، وَظَنّ الْمَغْفِرَة عِنْد الاستغفار.

معاني بعض الكلمات:

(وَأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي) أي معه بالرحمة والتوفيق والهداية والرعاية. شرح النووي على صحيح مسلم :ج ١٧ ص ٢.

(ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي) ذكرته بثواب لا أطلع عليه أحداً. التيسير بشرح الجامع الصغير ج ٢ ص ٣٦٩.

(تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا) ومعناه من تقرب إلى بطاعتي تقربت إليه برحمتي والتوفيق والاعانه. المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج ج ١٧ ص٣.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە دەفەرموێت بەندە چۆن گومانم پێ دەبات من وام (واتە کاتی داوام لێ دەکات گومانی وابێ بە من قبووڵ بووە ئەوە داواکەی قبووڵ دەکەم، وە کاتی داوای گەڕانەوە دەکات لە گوناهەکانی

گومانی وابێ بە من گوناهەکانی دەسڕمەوە ئەوە هەموو گوناهـەکانی دەسـڕمەوە، وە کاتێ داوای لێخۆشبوون دەکات گومانی وابێ بە من لێی خۆش دەبم ئـەوە لێـی خۆش دەبم.... هتد) من لەگەڵ بەندەم (واتە بە سۆزو میهرەبانیەوە ڕێنیـشاندەرو بە پاڵپشتی وە بە سەر خستنی کارەکانی لە دونیاو قیامەت) کـاتێ یـادم دەکـات، ئەگەرلە ناخی خۆی یادی کردم (واتە بە تەنهایی یادی خوای گەورە بکات) منـیش (واتە خوای گەورە یادی بە پاداشت دەکا کە هیچ کەسێکیش نـەزانی)، وە ئەگـەر لەناو خەڵك یادو باسی کردم، منیش لەلایەن باشترین کۆمـەڵ یـادی دەکـەم (واتـە لای باشـترین فریشتەکانی جـا ئەمـەش ڕێزلێنانـە بـۆ بەنـدە)، وە ئەگـەر بەنـدەم بستێك لێم نزیك بوەوە (واتە لەخوا پەرستی بەڵام کەم بوو) من بە باڵێك لێی نزیك دەبمـەوە (واتـە لـە سـۆزو میهرەبانەیـەوە ڕێنیـشاندەرو بـە پاڵپـشتی) وە ئەگـەر بەندەم بەباڵێك لێم نزیك بوەوە (واتە خوا پەرستی زیاتر کرد) مـن بـە گـەزێك لێـی نزیك دەبمەوە (واتە لە سۆزو میهرەبانیەو ڕێنیشاندەرو بە پاڵپشتی زیاتر دەبێـت) وەئەگەر بەڕۆیـشتن بێـت بـۆ لام (واتـە خـوا پەرسـتی زۆرتـر بـوو) مـن بـە تاڵوکـە (هەروەلە) دێمە لای (واتە ئەو جارەیان زیاتر دەبێت لـە جـارانی پێشتر لـە ڕووی سۆزو میهرەبانی و پاداشت و لێخۆشبوونی خوای گەورە).

۞عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَسِيرُ فِى طَرِيقِ مَكَّةَ فَمَرَّ عَلَى جَبَلٍ يُقَالُ لَهُ جُمْدَانُ فَقَالَ « سِيرُوا هَذَا جُمْدَانُ سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ ». قَالُوا وَمَا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ ». رواه مسلم (٦٩٨٤).

المفردون: الذاكرون الله كثيرا والمفرد الذى انفرد بأمر وجعله شغله الشاغل.

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) کاتێ بە ڕێگـایێکی مەککـەدا دەڕۆیـشت بـە تەنیـشت چیایەکی تێپەڕی کە پێی دەوترا جومدان، فەرمووی (المفردون) پێش کەوتن (واتە

بردیانـــەوە) ووتیـــان ئـــەی پێغەمبـــەری خـــوا (ﷺ) (المفـــردون) چ کەســـانێکن؟ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی ئەو پیاو و ئافرەتانەن کە یادی خوای گەورە زۆر دەکەن.

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ قَالَ أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْرَابِيَّانِ فَقَالَ أَحَدُهُمَا مَنْ خَيْرُ الرِّجَالِ يَا مُحَمَّدُ قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ طَالَ عُمْرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ وَقَالَ الْآخَرُ إِنَّ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيْنَا فَبَابٌ نَتَمَسَّكُ بِهِ جَامِعٌ قَالَ لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. رواه أحمد (١٧٦٨٠) و المعجم الأوسط – الطبراني (٢٢٦٨).

**واتە: دوو (عەرەبی ڕەشماڵ نشین) هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکیان ووتـی ئەی محمد (ﷺ) باشـترین پیـاو کـێ یـە، پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی ئەوکەسـەی تەمـەنی درێـژبێت و کاریـشی بـاش بێـت، ئـەوەی تـریش ووتـی ئـاینی ئیـسلام شەرائیعی زۆر بووە لەسەرمان دەرگایەك (واتە ڕێگایەکمان پـێ بڵـێ) دەسـتی پـێ بگرین وە کۆکەرەوە بێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی با هەردەم زمانـت تـەڕبێت بـە یادی خوای گەورە.**

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمْ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ الْإِمَامُ الْعَادِلُ وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ. رواه البخاري (٦٦٠).

معاني بعض الكلمات:

(يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ) يعني في ظل عرشه فلا يصيبهم وهج الحر في ذلك الموقف.

التيسير بشرح الجامع الصغير: ج١ ص ١٠٥٠.

(وَرَجُلَانِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ) معناه اجتمعا على حب الله وافترقا على حب الله أي كان سبب اجتماعهما حب الله واستمرا على ذلك حتى تفرقا من مجلسهما وهما صادقان في حب كل واحد منهما. شرح النووي على صحيح مسلم: ج ٧ ص ١٢١.

واته: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی حەوت کەس هەیە لەژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەن (چونکە ئەو ڕۆژە زۆر گەرمە، وە ڕۆژ لە سەر سەریانە جا هەر کەسە بە پێی کارو کردەوەی ڕوو دەچێت بەڵام ئەم حەوت چینە پارێزراون) لەو ڕۆژە هیچ سێبەرێك نیە تەنها سێبەری عەرشی خوای گەورە نەبێت:

١- پێشەوایەکی دادپەروەر.

٢- گەنجێك لەسەرەتایەوە بە ئاینی خوای گەورە پەروەردە بووبێت لە سەر خواپەرستی.

٣- پیاوێك دڵی بەمزگەوتەوە بەند بێت (واتە هەموو نوێژەکانی لەمزگەوت بکات، جا چاوەڕێی نوێژەکان بکات تا یەك لە دوای یەك لە مزگەوت جێبە جێان بکات).

٤- دووکەس یەکتریان خۆش بووێت لەبەر خوای گەورە وە کۆبونەوە لەسەر ئەم بنەمایە وە کە لە یەکتریش جودابوونەوە هەر لەبەر خۆشەویستی خوای گەورە بێت (جا بزانە ئەگەر یەکێك موسڵمانێکی تەواو بوو دەبێت خۆشت بووێت لەبەر خوای گەورە ئەگەر براشت نەبێت، ناشبێ یەکێکت خۆش بووێت ئەگەر موسڵمان نەبێت لەبەر خوای گەورە ئەگەر براشت بێت جا ئەمە خۆشەویستی ڕاستیە بۆ خوای گەورە).

٥- پیاوێك ئافرەتێکی خانەدان و جوان داوای لێ بکات بۆ کاری خراپ ئەویش بڵێت من لە ترسی خوای گەورە ئەم کارە ناکەم

٦- پیاوێك خێر بکات بەدەستی ڕاست دەستی چەپی نەزانێت

٧- پیاوێك بەتەنیا یادی خوای گەورە بکات فرمێسك لەچاوەکانی بێتە خوارێ.

**تێبینی:** موسڵمانی ڕاستەقینە نابێ ڕقی لە هیچ مرۆڤێك بێتەوە وەك مرۆڤ (واتە ئەگەر بێ بڕواش بوو) بەڵام دەبێت ڕقمان لە کارە خراپەکانی بێتەوە، چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي ءَادَمَ) واتە ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم ناوە (وە هەروەها ئەمانیش دروستکراوی خوای گەورەن).

ئاگاداری: ئەو چینانەی کە لەژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەن تەنها ئەو حەوت کەسە نینە بەڵکو زیاترن (الامام السيوطي) هەمووی باسکردووە لە کتابی (تمهيد الفرش).

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ « لاَ يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ ». رواه مسلم (٧٠٣٠).

(وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ) يعني في الملائكة المقربين. فيض القدير شرح الجامع الصغير ج ٥ ص ٤٩٤.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی دانیشتنی هەر کۆمەڵە کەسانێك کە یادی خوای باڵا دەست بکەن ئەوە بەدڵنیایی فریشتەکان باڵی سۆز و میهرەبانیان بەسەردا دەکێشی وە ئارامی بەسەر دڵیاندا دێت وە خوای گەورە باسی ئەو کەسانە دەکات لە لای فریشتە موقەڕەبەکانی خۆی (واتە فریشتە نزیکەکان

ئەمەش وەك ڕێزلێنانە بۆ بەندە کاتێ یادی خوای گەورە دەکەن جا هەر کەسێك دەیەوێت ناوی بێنن با زۆر یادی خوای گەورە بکات).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « إِنَّ لِلَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى مَلاَئِكَةً سَيَّارَةً فُضُلاً يَتَتَبَّعُونَ مَجَالِسَ الذِّكْرِ فَإِذَا وَجَدُوا مَجْلِسًا فِيهِ ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ وَحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِأَجْنِحَتِهِمْ حَتَّى يَمْلَئُوا مَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَإِذَا تَفَرَّقُوا عَرَجُوا وَصَعِدُوا إِلَى السَّمَاءِ - قَالَ - فَيَسْأَلُهُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ مِنْ أَيْنَ جِئْتُمْ فَيَقُولُونَ جِئْنَا مِنْ عِنْدِ عِبَادٍ لَكَ فِي الأَرْضِ يُسَبِّحُونَكَ وَيُكَبِّرُونَكَ وَيُهَلِّلُونَكَ وَيَحْمَدُونَكَ وَيَسْأَلُونَكَ.

قَالَ وَمَاذَا يَسْأَلُونِي قَالُوا يَسْأَلُونَكَ جَنَّتَكَ. قَالَ وَهَلْ رَأَوْا جَنَّتِي قَالُوا لاَ أَىْ رَبِّ. قَالَ فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا جَنَّتِي قَالُوا وَيَسْتَجِيرُونَكَ. قَالَ وَمِمَّ يَسْتَجِيرُونَنِي قَالُوا مِنْ نَارِكَ يَا رَبِّ. قَالَ وَهَلْ رَأَوْا نَارِي قَالُوا لاَ. قَالَ فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا نَارِي قَالُوا وَيَسْتَغْفِرُونَكَ - قَالَ - فَيَقُولُ قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ فَأَعْطَيْتُهُمْ مَا سَأَلُوا وَأَجَرْتُهُمْ مِمَّا اسْتَجَارُوا - قَالَ - فَيَقُولُونَ رَبِّ فِيهِمْ فُلاَنٌ عَبْدٌ خَطَّاءٌ إِنَّمَا مَرَّ فَجَلَسَ مَعَهُمْ قَالَ فَيَقُولُ وَلَهُ غَفَرْتُ هُمُ الْقَوْمُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ ». رواه مسلم (٧٠١٥).

(وَحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِأَجْنِحَتِهِمْ) معناه: أشار بعضهم لبعض بالنزول. المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج ج١٧ ص١٤.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە هەندێ فریشتەی هەیە دەسوڕێنەوە (لەسەر زەوی) کاری ئەم فریشتانە گەڕانە بەدوای ئەو دانیشتنانەی کەیادی خوای تێدا دەکرێت، کاتێ ئەم شوێنە دەدۆزنەوە کەیادی خوای گەورەی تێدا دەکەن لەگەڵیان دادەنیشن، ئینجا فریشتەکان ئاماژە بە یەکتر دەکەن بۆ ئەم شوێنە یەك لە دوای یەك دێن وە باڵەکانیان لە هەموو لایەکەوە لەسەر یەکتر دادەنێن هەتا لەنێوان ئەو کەسانەی کە دانیشتوون تاوەکو ئاسمانی دونیا

پەردەکەنەوە، کاتێ ئەم دانیشتنە پەرتەی پێ کرا (فریشتەکان) بەرەو ئاسمان بەرز دەبنەوە، فەرمووی ئینجا خوای گەورە پرسیاریان لێ دەکا؟ وە خوای گەورە لەوان باشتر دەزانی (کە بەندەی چ دەکات)، پێیان دەفەرمووێ ئەوە لە کوێ هاتوونەوە؟ دەڵێن لای ئەو بەندانەی تۆ هاتووین کەلەسەر زەوی– (تسبیحات) و (الله أكبر ) و (لا إله الا الله) و (الحمدلله )ی تۆیان دەکرد، وە داوایان لە تۆ دەکرد؟ خوای گەورە فەرمووی چ داوایەکیان دەکرد؟ دەڵێن داوای بەهەشتیان لێ دەکردی؟ خوای گەورە پێیان دەفەرمووێ ئایا ئەوانە بەهەشتی منیان بینیوە دەڵێن نەخێر ئەی پەروەردگارە، خوای گەورە دەفەرمووێ ئەی ئەگەر بەهەشتی من ببینن چی دەکەن!، لە پاشان دەڵێن خوایە خۆیان بە تۆ دەپاراست، خوای گەورە پێیان دەفەرمووێ لە چ داوای پاراستنیان لێ دەکردم؟ دەڵێن لەئاگری (دۆزەخ) ئەی پەروەردگارە، خوای گەورە دەفەرمووێ ئایا ئەوانە ئاگری منیان بینیوە؟ دەڵێن نەخێر! خوای گەورە دەفەرمووێ ئەی ئەگەر ببینن چ دەکەن! لە پاشان دەڵێن داوای لێ خۆشبونیان لێ دەکردی، خوای گەورە دەفەرمووێ ئەوە لێیان خۆش بووم (واتە لەو کەسانەی کە دانیشتینە لەم شوێنە) وە ئەوەی داوایان کردبوو پێم دان (واتە ڕەزامەندی خوای گەورە لەگەڵ بەهەشت) وە ئەوانم پاراست لەوەی کەداوای پاراستنیان لێ کردبووم (واتە لە ئاگری دۆزەخ و ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی)، دەڵێن ئەی پەروەردگارە کەسێك شایستەی ئەوە نیە (لێی خۆش بی) چونکە بەوێدا تێ دەپەڕی لەگەڵیان دانیشت، خوای گەورە دەفەرمووێ لەویش خۆش بووم چونکە ئەم کەسانە ئەوەی لەگەڵیان دانیشێ سەر گەردان نابێت (واتە بچێتە دۆزەخ).

## خێری صەڵاوات لێدان

۞عَنْ أَبِي طَلْحَةَ الْأَنْصَارِيِّ قَالَ أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمًا طَيِّبَ النَّفْسِ يُرَى فِي وَجْهِهِ الْبِشْرُ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصْبَحْتَ الْيَوْمَ طَيِّبَ النَّفْسِ يُرَى فِي وَجْهِكَ الْبِشْرُ قَالَ أَجَلْ أَتَانِي آتٍ مِنْ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فَقَالَ مَنْ صَلَّى عَلَيْكَ مِنْ أُمَّتِكَ صَلَاةً كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ وَمَحَا عَنْهُ عَشْرَ سَيِّئَاتٍ وَرَفَعَ لَهُ عَشْرَ دَرَجَاتٍ وَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَهَا. رواه احمد (١٦٣٥٢) و الطبراني في الكبير (٤٧٢٠) وغيرهما.

(وردّ عليه مثلها) أي يقول عليك صلاتي على وفق القاعدة أنّ الجزاء من جنس العمل.

واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) بە دەرونێکی پاك و ڕوخسارێکی مژدەدەر بینرا ووتیان ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) بۆ وا ئەمرۆ دەرونێکی پاك و ڕوخسارێکی مژدەدەرت پێوە دیارە فەرمووی بەڵێ یەکێك لەلای خوای گەورە هاتە لام ووتی هەر یەکێك لە ئومەتی تۆ صەلەواتێکت لەسەر بدا خوای گەورە (دە) چاکەی بۆ دەنووسرێت وە (دە) گوناهی لەسەر لا دەبات وە (دە) پلە و پایەی بەرز دەکاتەوە وە خوای گەورە صەڵاوتی لەسەر لێدەداتەوە (واتە هەر وەك ئەو صەڵاوەتی لەسەر پێغەمبەر لێداوە، جا صەڵاواتی خوای گەورە بەواتای ڕەحمەتوو لێخۆشبوون دێت بۆ بەندە).

۞عَنْ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرَ صَلَوَاتٍ وَحَطَّ عَنْهُ عَشْرَ خَطِيئَاتٍ. رواه احمد (١١٩٩٨) و النسائي في الكبرى (٩٨٩١).

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك صەلەواتێك لەسەر من بدا خوای گەورە (دە) صەڵاواتی لەسەر لێدەداتەوە وە (دە) گوناهی لەسەر لا دەبات.

جا لەو دوو فەرموودەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە یەکێك صەلەواتێك بڵێ ئەوە خوای گەورە ئەم پاداشتانەی پێدەدات هەروەك لەو خشتەی خوارەوە دیارە: ووتنی صلی الله علیه وسلم :

| ١- نووسینی چاکە | ٢- سڕینەوەی گوناه | ٣- بەرز کردنەوەی پلەو پایە |
| --- | --- | --- |
| ١٠×١٠= ١٠٠ لە ڕۆژێك | ١٠×١٠= ١٠٠لە ڕۆژێك | ١٠×١٠= ١٠٠لە ڕۆژێك |
| ١٠٠× ٣٠ = ٣٠٠٠ لە یەك مانگ | ١٠٠× ٣٠ = ٣٠٠٠ لە یەك مانگ | ١٠٠× ٣٠ = ٣٠٠٠ لە یەك مانگ |
| ٣٠٠٠×١٢ = ٣٦٠٠٠ لە یەك ساڵ | ٣٠٠٠×١٢ = ٣٦٠٠٠ لە یەك ساڵ | ٣٠٠٠×١٢ = ٣٦٠٠٠ لە یەك ساڵ |
| ٣٦٠٠٠ ×٢٠ = ٧٢٠٠٠٠ لە ٢٠ ساڵ | ٣٦٠٠٠ ×٢٠ = ٧٢٠٠٠٠ لە ٢٠ ساڵ | ٣٦٠٠٠ ×٢٠ = ٧٢٠٠٠٠ لە ٢٠ ساڵ |

ئەگەر یەك بە (٧٠٠) بێت دەكاتە :

١- ٧٢٠٠٠ × ٧٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ چاكەت بۆ دەنوسرێ لە (٢٠) ساڵ.

٢- ٧٢٠٠٠ × ٧٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناه لە (٢٠) ساڵ.

٣- ٧٢٠٠٠ × ٧٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ بەرز كردنەوەی پلەو پایە لە (٢٠) ساڵ.

## خێری ووتنی (سبحان الله وبحمده)

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ". رواه البخاري (٦٤٠٥) و مسلم (٧٠١٨).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەكێك لە ئێوە ڕۆژێ سەد جار بڵێ (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ) گوناهەكانی لەسەر لادەچێت ئەگەر وەك كەفی دەریا بێت.**

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِى سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ عَلَيْهِ ». رواه مسلم (٧٠١٩).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەكێك بەیانیان و ئێواران ڕۆژی (سەد) جار بڵێ (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ) هیچ كەسێك لە ڕۆژی دوایی ناتوانی لەمە چاكتر بەدەست بێنێت تەنها یەكێك نەبێ وەك ئەمە بڵێ یان زیاتر.**

❁عَنْ أَبِى ذَرٍّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « أَلاَ أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللَّهِ »، قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِى بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللَّهِ، فَقَالَ « إِنَّ أَحَبَّ الْكَلاَمِ إِلَى اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ ». رواه مسلم (٧١٠٢).

واتــە: پێغەمبــەرمان (ﷺ) بــە (أبى ذر )ى فــەرمووو پێــت بڵــێم خۆشەویسترین ووشــە لای خــوای گــەورە چییە ووتم ئــەی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) پــێم بڵــێ خۆشەویسترین ووشە لای خوای گەورە چییە فەرمووی (خۆشەویسترین ووشــە لای خوای گەورە (ئەوەیە بڵێ)ی ( سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ ).

## خێری ووتنی ( سبحان الله )

❁عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ حَدَّثَنِى أَبِى قَالَ كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ « أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ ». فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ قَالَ « يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ ». رواه مسلم (٧٠٢٧).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەیە لە ئێوە نەتوانی لە هەر ڕۆژێکدا هەزار چاکە بەدەست نەهێنێت یەکێك لەوانەی کە لە خزمەتی دانیشتبوون پرسیاری کرد چۆن دەتوانین هەزار چاکە بەدەست بێنین پێغەمبــەر (ﷺ) فــەرمووی (ســەد جار تەسبیحاتی خوای گەورە بکە (واتە بڵێ سبحان الله) هەزار چاکەی بۆ دەنوسرێت یان هەزار گوناهی لەسەر لادەچێت).**

جا لە دوو خاڵ ئەمە باس دەکەین کە بزانین چاکە لە گەڵ سڕینەوەی گوناه هەریەك بە تەنها چەندە:

١- نووسینی چاکە بەووتنی (١٠٠) سبحان الله لەڕۆژێك (١٠٠٠) چاکەی بۆ دەنوسرێ سەیری خشتەی خوارەوە بکە ئەگەر چاکە:

یەك بە (١٠) بێت..

| |
|---|
| ئەگەر ١٠٠ سبحان الله لە رۆژیکدا بڵی ئەویش بە یەك خولەك تەواو دەبێت دەکاتە<br>١٠٠٠ × ١٠ =١٠٠٠٠چاکە لەیەك رۆژدا تەنها |
| ١٠٠٠٠×٣٠= ٣٠٠٠٠٠ چاکە لە ١ مانگ |
| ٣٠٠٠٠٠ ×١٢ = ٣٦٠٠٠٠٠ چاکە لە ١ ساڵ |
| ٣٦٠٠٠٠٠×٢٠ = ٧٢٠٠٠٠٠٠چاکە لە ٢٠ ساڵ |

ئەگەر یەك بە (٧٠٠) بێت ئەوە:

٧٢٠٠٠٠٠٠× ٧٠٠= ٥٠٤٠٠٠٠٠٠٠٠ چاکەت بۆ دەنوسرێت لە ماوەی (٢٠) ساڵ جا کەس هەیە ئەوە بزانێت وە ئەم یادە نەکات؟.

٢- سڕینەوەی گوناه بە ووتنی (١٠٠) سبحان الله لەڕۆژێك (١٠٠٠) گوناهت لەسەر لا دەچێت سەیری خشتەی خوارەوە بکە ئەگەر یەك بە (١٠) بێت..

| |
|---|
| ئەگەر ١٠٠ سبحان الله لە ڕۆژێکدا بڵێ ئەویش بە یەك خولەك تەواو دەبێت دەکاتە ١٠٠ × ١٠ =١٠٠٠ گوناه لا دەچێت لەیەك ڕۆژدا تەنها |
| ١٠٠٠×٣٠= ٣٠٠٠٠ گوناه لا دەچێت لە ١ مانگ |
| ٣٠٠٠٠ ×١٢ = ٣٦٠٠٠٠ گوناه لا دەچێت لە ١ ساڵ |
| ٣٦٠٠٠٠×٢٠ = ٧٢٠٠٠٠٠ گوناه لا دەچێت لە ٢٠ ساڵ |

ئەگەر یەك بە (٧٠٠) بێت بۆ لا دانی گوناه ئەوە :

٧٢٠٠٠٠٠×٧٠٠= ٥٠٤٠٠٠٠٠٠٠ گوناه لا دەچێت لە ماوەی (٢٠) ساڵ.

## خێری ووتنی (الحمد لله)

۞عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم « الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلآنِ - أَوْ تَمْلأُ - مَا بَيْنَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَالصَّلاَةُ نُورٌ وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا..».رواه مسلم (٥٥٦).

معاني بعض الكلمات:

(والحمد لله تملأ الميزان) أي: أجرها يملأ ميزان الحامد لله تعالى.

(والصلاة نورٌ) أي: لصاحبها في الدنيا، وفي القبر، ويوم القيامة.

(والصدقة برهان) أي: دليلٌ واضح على صحة الإيمان.

(والصبر ضياء) أي نور قوي تنكشف به الكربات. التيسير بشرح الجامع الصغير ج ٢ ص ٢٤١.

(والقرآن حجةٌ لك أو عليك) أي: إن عملت به فهو حجة لك، وإلا فهو حجة عليك (كل الناس يغدو فبائعٌ نفسه فمعتقها أو موبقُها) أي: كل إنسان يسعى، فمنهم من يبيع نفسه لله بطاعته فيعتقها من النار، ومنهم مَنْ يبيعها للشيطان والهوى فيهلكها.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی پاکی نیوەی ئیمانە، وە (الحمدلله) تەرازوو پڕ دەکات (تەرازووی پاداشت لە ڕۆژی دوایی)، وە (سبحان الله والحمدلله) نێوان ئاسمانەکان و زەوی پڕ دەکات (واتە لەپاداشت)، وە نوێژ ڕووناکیە (واتە بۆ خاوەنەکەی لە دونیا و ناو گۆڕ و ڕۆژی قیامەت)، وە خێرکردن بەڵگەیە (واتە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای ڕاستی ئیمانە)، وە ئارامگرتن ڕووناککەرەوەیە (واتە ڕووناکیەکی وا بە هێزە هەموو ناخۆشیەکان لا دەبات)، وە قورئان بەڵگەیەکی سەپێندراوە بۆت یا لە سەرت (واتە ئەگەر کاری پێ بکەی بەڵگەیە بۆ قیامەت بۆ ئازاد بوونت لە دۆزخ یاخود ئەگەر کاری پێ نەکەی بەڵگەی لە سەرت واتە شاهێدیت لە سەر لێدەدات لە ڕۆژی دوایی بۆ جێ بەجێ نەکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە)، وە هەموو خەڵك هەوڵدەدەن (لەو دونیایە) جا هەیە نەفسی خۆی دەفرۆشێتە خوای گەورە (واتە هەرچی خوای گەورە فەرمانی پێ کردیە دەیکات بە پی ئەو توانایەی کە هەیەتی جا خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ ئازدی دەکات وە هەیە خۆی دەفرۆشێتە شەیتان و ئارەزوەکانی جا بە هیلاکی دەبا (بەرەو دۆزەخی دەبا).

## خێری ووتنی (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) لەگەڵ (سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ)

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ. رواه البخاري (٦٦٨٢) و مسلم (٧٠٢١).

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی دوو ووشە هەیە لەسەر زمان سووکن، وە لەسەر تەرازوو گرانن، خۆشەویستی خوای بەخشندەن (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ).

## خێری ووتنی
## (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ)

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ جُوَيْرِيَةَ أَنَّ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا (اي عند جُوَيْرِيَةَ) بُكْرَةً حِينَ صَلَّى الصُّبْحَ وَهِيَ فِى مَسْجِدِهَا ثُمَّ رَجَعَ بَعْدَ أَنْ أَضْحَى وَهِيَ جَالِسَةٌ فَقَالَ « مَا زِلْتِ عَلَى الْحَالِ الَّتِى فَارَقْتُكِ عَلَيْهَا »، قَالَتْ نَعَمْ، قَالَ النَّبِىُّ -صلى الله عليه وسلم- « لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ مُنْذُ الْيَوْمِ لَوَزَنَتْهُنَّ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ ». رواه مسلم (٧٠٨٨).

معانى بعض الكلمات:

(في مسجدها) أي: موضع صلاتها.

(لوَزَنَتْهُنَّ) أي لترجحت تلك الكلمات على جميع أذكارك وزادت عليهن في الأجر والثواب. عون المعبود شرح سنن أبي داود ج ٤ ص ٢٥٩.

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) پاش نوێژی بەیانی لە مزگەوت تۆزێك زوو دەرچوو (جویرەی خێزانی پێغەمبەری (ﷺ) لە مزگەوت ماوە (واتە لە جێگای تایبەتی نوێژکردنی خۆی)، لە پاش چێشتەنگاو گەڕاوە بینی (جویرە) هەر وا دانیشتوە

(واتە لە نوێژی بەیانی تا چێشتەنگاو لە مزگەوتە لە شوێنی خۆی بوو) پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو تۆ چۆن بەجێم هێشتی هەر لەسەر ئەوە مایەوە (واتە هەر وا لە شوێنی خۆت دانیشتی خواپەرستی دەکەی) ووتی بەڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لە پاش تۆ چوار ووشەم سێ جار ووت (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ)، ئەگەر ئەم ووشانە بکێشرێت لە هی تۆ زیاترە لە پاداشت لە وەی کە ئەورۆ ووتوتە لە زیکرکردن.

## خێری ووتنی (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ)

۞عَنْ أَبِى مُوسَى قَالَ كُنَّا مَعَ النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- فِى سَفَرٍ فَجَعَلَ النَّاسُ يَجْهَرُونَ بِالتَّكْبِيرِ فَقَالَ النَّبِىُّ -صلى الله عليه وسلم يَا عَبْدَ اللَّهِ بْنَ قَيْسٍ أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَنْزٍ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ »، فَقُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ « قُلْ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ ». رواه مسلم (٧٠٣٧) وغيره.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بە (عبدللە)ی کوڕی قەیسی فەرموو پێتی نەڵێم گەنجینەك لە گەنجینەکانی بەهەشت چۆن بەدەست دێنی ووتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی بڵێ (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ).

## خێری ووتنی

## (لَا إلَهَ إلَّا اللّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ وَكُتِبَ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنْ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ إِلَّا رَجُلٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْهُ. رواه البخاري (٦٤٠٣).

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك لەڕۆژێکدا (سەد) جار بڵێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) وەك ئەوە بۆی هەیە بە ئەندازەی (دە) کۆیلەی ئازاد کردبێ وە (سەد) چاکەی بۆ دەنوسرێ وە (سەد) گوناهی لە سەر لادەچێت وە ئەو کەسە پارێزراو دەبێت لە شەیتان لە بەیانی تاکو ئێوارە وە هیچ کەسێك ناتوانی لەوە چاکتر بەدەست بێنێت (واتە لە ڕۆژی دوایی) لە چاکە کردن جگە لەو کەسەی کە ئەم کارەی (واتە زیکر )ی زیاتر ووتبێ.

بۆ زیاتر زانینی پاداشتی ئەم یادە دەتوانین بڵێین :

ووتنی (١٠٠) جار ئەم زیکرە لە ڕۆژێکدا وەك ئەوەیە (١٠) کەس ئازاد بکەیت وە (١٠٠) چاکەت بۆ دەنووسرێت وە (١٠٠) گوناهت لەسەر لادەچێت.

سەیری خشتەی سەروە بکە:

١- نوسینی چاکە ئەگەر یەك بە (دە) بێت: واتە ١٠٠ × ١٠ = ١٠٠٠

| |
|---|
| ١٠٠٠ چاکە لە یەك رۆژ بە ٤ خولەك |
| ١٠٠٠×٣٠= ٣٠٠٠٠ چاکە لە یەك مانگ |
| ٣٠٠٠٠×١٢= ٣٦٠٠٠٠ چاکە لەساڵێك |
| ٣٦٠٠٠٠× ٢٠ = ٧,٢٠٠,٠٠٠ چاکە لە ٢٠ساڵ |

٢- ئازادکردن کۆیلە ئەگەر یەك بە (دە) بێت: واتە ١٠ × ١٠ = ١٠٠

| |
|---|
| بە٤خولەك ١٠٠ کەس ئازاد بکەی لە رۆژێك |
| ١٠٠×٣٠= ٣٠٠٠ کەس لە یەك مانگ ئازاد بکەی |
| ٣٠٠٠×١٢ = ٣٦٠٠٠ کەس لە ساڵێکدا ئازاد بکەی |
| ٣٦٠٠٠×٢٠ = ٧٢٠٠٠٠ کەس لە ٢٠ ساڵ ئازاد بکەی |

٣- سڕینەوەی گوناه ئەگەر یەك بە (دە) بێت: واتە ١٠٠ × ١٠ = ١٠٠٠

| |
|---|
| ١٠٠٠ سڕینەوەی گوناه لە یەك رۆژ بە٤ خولەك |
| ١٠٠٠×٣٠= ٣٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناه لە یەك مانگ |
| ٣٠٠٠٠×١٢= ٣٦٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناه لەساڵێك |
| ٣٦٠٠٠٠× ٢٠ = ٧٢٠٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناه لە ٢٠ساڵ |

جا ئەگەر خوای گەورە یەك بە (٧٠٠) بنووسی ئەوکاتە دەکاتە :

١- ٧٢٠٠٠٠٠ × ٧٠٠ = ٥,٠٤٠,٠٠٠,٠٠٠ چاکە لە ماوەی (٢٠) ساڵ.

٢- ٧٢٠٠٠٠×٧٠٠ = ٥٠٤,٠٠٠,٠٠٠ کەس ئازاد بکەی لە ماوەی (٢٠) ساڵ.

٣- ٧٢٠٠٠٠٠×٧٠٠ = ٥,٠٤٠,٠٠٠,٠٠٠ سڕینەوەی گوناه لە (٢٠) ساڵ.

جا موسڵمانی بە ڕێز توخوا چۆن ئەم هەڵە لە دەستی خۆت دەدەی پەلە بکە بۆ زیادکردنی چاکەو سڕینەوەی گوناهەکان هەتا لەدونیادا ماوی، چونکە ئەمڕۆ کارە لێپرسینەوە نییە، بەڵام لە ڕۆژی دوایی لێپرسینەوەیە کار نییە.

## خێری ووتنی ( لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ )

(قال بعض العلماء) وردت ايات قرآنية تدل على قولي لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ:

**واتە هەندێك لە زاناکان دەڵێن چەند ئایەتێك هەیە لە قورئان ئاماژە بە (لا اله الا الله) دەکات:**

كقوله تعالى: " أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ " أنَّه لا إله إلاَّ الله. سورة ابراهيم (٢٤)

" إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ "اي لا إله إلاَّ الله ". سورة فاطر (١٠)

وَتَواصَوْا بالحَقِّ "اي بلا إله إلاَّ الله. سورة العصر (٣)

" قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُمْ بِوَاحِدَةٍ " بلا إله إلاَّ الله. سورة سباء (٤٦)

" وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئولُون " عن قول لا إله إلاَّ الله. سورة الصافات (٢٤)

" بَلْ جَاءَ بالحَقِّ وَصَدَّقَ المرْسَلِين " هو لا إله إلاَّ الله. سورة الصافات (٣٧)

" يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بالقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا " هو لاَ إله إلاَّ الله. سورة ابراهيم (٢٧)

" وَيُضِلُّ اللَّهُ الظَّالِمِينَ " عن قول: لا إله إلاَّ الله. سورة ابراهيم (٢٧). اللباب في علوم الكتاب ج١٣ ص ١٨٠.

۞عَنْ أبي سعيد الخدري رضي الله عنه: عن رسول الله صلى الله عليه و سلم قال: قال موسى عليه السلام: يا رب علمني شيئا اذكرك به و أدعوك به قال: يا موسى قل: لا إله إلا الله قال: يا رب كل عبادك يقول هذا قال: قل لا إله إلا الله قال: لا إله إلا أنت رب إنما أريد شيئا تخصني به قال: يا موسى لو كان السموات السبع و عامرهن غيري و

الأرضين السبع في كفة و لا إله إلا الله في كفة مالت بهن لا إله إلا الله. رواه الحاكم في المستدرك (١٩٣٦) وقال: صحيح الإسناد و النسائي في الكبرى (١٠٦٧٠).

**واتـه: پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی پێغەمبـەر موسـی (ﷺ) فـەرمووی ئـەی پەروەردگارە شتێکم فێر بکە یادتی پێ بکەم وە داواشت بـەوی لـێ بکـەم، خـوای گەورە فەرمووی ئەی موسی (ﷺ) بڵێ (لااله إلا الله)، فەرمووی ئەی پەروەردگارە هەموو بەندەکان ئەمە دەڵێن، خوای گەورە فەرمووی بڵێ (لالـه إلا الله) فـەرمووی (لااله إلا أنت) (واتە هیچ خوایەك نیە جگە لە تۆ) بەڵام مـن دەمـەوێت تایبـەت بـێ تەنها بە من، خوای گەورە فەرمووی ئەی موسی ئەگەر هاتوو حەوت ئاسمانەکان و ئەوانەی ئاوەدانیان کردووە (واتە فریشتە و مرۆڤ....هتد) جگە لەمن (واتە لە زاتی خوای گەورە) لەگەڵ حەوت زەویەکان لەلایەك بێ وە (لااله إلا الله )ش لەلایەك بێ، ئەوە (لااله إلا الله) لە هەمووان گرانترە.**

۞عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قال سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ أَفْضَلُ الذِّكْرِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ لِلَّهِ). رواه الترمذي (٣٣٨٣) و ابن حبان بترتيب ابن بلبان (٨٤٦) وغيرهما.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی چاکترین یاد کردنەوەی خوای گەورە (لالـه إلا الله) یە وە چاکترین پاڕانەوە (الحمدلله )یە.**

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ نُوحًا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ قَالَ لِابْنِهِ إِنِّي قَاصٌّ عَلَيْكَ الْوَصِيَّةَ آمُرُكَ بِاثْنَتَيْنِ وَأَنْهَاكَ عَنْ اثْنَتَيْنِ آمُرُكَ بِلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَإِنَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعَ وَالْأَرَضِينَ السَّبْعَ لَوْ وُضِعَتْ فِي كِفَّةٍ وَوُضِعَتْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فِي كِفَّةٍ رَجَحَتْ بِهِنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَلَوْ أَنَّ السَّمَوَاتِ

وَبِحَمْدِهِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَصَمَتْهُنَّ حَلْقَةً مُبْهَمَةً كُنَّ السَّبْعَ وَالْأَرَضِينَ السَّبْعَ فَإِنَّهَا صَلَاةُ كُلِّ شَيْءٍ وَبِهَا يُرْزَقُ الْخَلْقُ وَأَنْهَاكَ عَنْ الشِّرْكِ وَالْكِبْرِ. رواه الإمام أحمد بن حنبل (٦٥٨٣). قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح

معاني بعض الكلمات:

(حلقة مبهمة) :مغلقة.

(قصمتهن ): كسرتهن لا إله إلا الله.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا نوح (ﷺ) کاتێ مردنی نزیك ببوەوە بە کوڕەکەی فەرموو وەسیەتت دەکەم وە فەرمانت پێ دەکەم بە دوو شت وە بە نەکردنی دوو شت، فەرمانت پێ دەکەم بە (لااله إلا الله) ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکان و حەوت زەویەکان لەلایەك بێ وە (لااله إلا الله )ش لەلایەك بێ، ئەوە (لااله إلا الله) گرانترە، وە ئەگەر هاتوو هەر حەوت ئاسمانەکان و زەویەکان وەك حەلقەیێکی داخراو بێت ئەوە (لااله إلا الله) لەتیان دەکات وە دەیانکاتە دوو پارچە، وە (سبحان الله وبحمده) دوعایە بۆ هەموو شتێك وە هەر بەمە ڕزق و ڕۆزی بە دروستکراوەکان دەدا، وە فەرمانت پێ دەکەم کە هاوتا بۆ خوای گەورە پەیدا نەکەی لەگەڵ خۆ بەگەورە نەزانی، واتە (تەکەبور )ت نەبێ.**

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا قَالَ عَبْدٌ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ قَطُّ مُخْلِصًا إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ حَتَّى تُفْضِيَ إِلَى الْعَرْشِ مَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ. رواه الترمذي (٣٥٩٠) والنسائي في الكبرى (١٠٦٦٩).

معاني بعض الكلمات:

(حَتَّى تُفْضِيَ إِلَى الْعَرْشِ) أي تنتهي إليه.

(مَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ) أي وذلك مدة تجنب قائلها الكبائر من الذنوب.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەرکاتێ بەندەیەك بە دڵ بڵێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) (واتە دور بێت لە ڕیایی) ئەوە بە دڵنیایی هەر حەوت دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێتەوە هەتاکو دەگاتە عەرشی خوای گەورە بە مەرجێك ئەو کەسەی ئەو یادە دەکات لەو ماوەیە لە گوناهە گەورەکان بەدوربێت.

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ. رواه البخاري (٩٩).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی دڵخۆشترین کەس کە شەفاعەتی بۆ بکەم لە ڕۆژی قیامەت یەکێکە بە دڵێکی پاك وبێ گەرد یاخود لە ناخی خۆیەوە بڵێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ).

۞عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ ». رواه ابو داود (٣١١٨) و الطبراني في الكبير(٢٢١).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر کەسێك دوا ووتەی لە دونیادا (لَاإِلَهَ إِلَّاَاللهُ) بێ، دەچێتە بەهەشت.

بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەی فەرموو « لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ». رواه مسلم (٢١٦٤).

واتە: لە لای ئەو نەخۆشانەتان کە نزیکە بمرن (لَاإِلَهَ إِلَّاَاللهُ) بڵێن. ڕوونـاکی رب العالمين ڕوونکردنەوەی منهاج الطالبين ج ٢ ص ١٠٧.

# خێری ووتنی

## (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّاهُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ)

❁عَنْ بِلاَلَ بْنَ يَسَارِ بْنِ زَيْدٍ مَوْلَى النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُنِيهِ عَنْ جَدِّى أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَنْ قَالَ أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ غُفِرَ لَهُ وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِنَ الزَّحْفِ ». رواه ابو داود (١٥١٩) و الترمذي (٣٥٧٧) وغيرهما.

قَوْلُهُ: [وَإِنْ كَانَ قَدْ فَرَّ مِنْ الزَّحْفِ]: قال أبو نعيم الأصبهاني: هذا يدل على أنَّ بعض الكبائر تُغفَر ببعض العمل الصالح. شذا الريحان في روائع رمضان ج ١ ص ١٥٧.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك بڵێ « أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ » ئەوە خوای گەورە لێی خۆش دەبێت ئەگەر لەبەرەی جەنگیش ڕای کردبێت (چونکە ڕاکردن لە بەرەی جەنگ تاوانێکی گەورەیە).**

**موسڵمانی بەرێز: هەر ووتنەکە بەتەنها مەرج نییە لە تۆبەکردن بەڵکو دەبێت بە کردەوەش بێت کاتی داوای لێخۆش بوون لە خوای گەورە دەکەیت دەبێت بەردەوام نەبێت لەو گوناهەی کە کردووتە هەروەك خوای گەورە لەم ئایەتە دەفەرمووێت:**

قال تعالى: (وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ) [آل عمران: ١٣٥].

**واتە: ئەوانەی کە کاتێ کردەویەکی ناشرین دەکەن یا ستەم لە خۆیان دەکەن کە یادی خوای گەورەیان کردەوە ئینجا داوای لێبوردن دەکەن بۆ گوناهەکانیان، ئایا کێ هەیە لە گوناهەکان ببوری بێجگە لە خوای گەورە نەبێت، بەڵام بەردەوام نەبوون لە سەر ئەوەی کە کردوویانە لە کاتێکدا بزانن کە گوناهە.**

ﷺعَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ قَالَ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ: أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الَّذِي لا إِلَهَ إِلَّاهُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ، وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، غُفِرَ لَهُ، وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِنَ الزَّحْفِ. رواه أبو داود (١٥١٩) والطَّبْرَانِيّ في الصَّغِيْرُ (٨٣٩).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەكێك لە دوای نوێژەكان بڵێ «أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ» ئەوە خوای گەورە لێی‌خۆش دەبێت ئەگەر لەبەرەی جەنگیش ڕای كردبێت (چونكە ڕاكردن لە بەرەی جەنگ تاوانێكی گەورەیە). لە فەرمودەی پێش تر باسی مەرجەكانمان كرد كە لێخۆش بوون چۆن بە دەست دێنی.**

ﷺعَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (وَاللَّهِ إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً). رواه البخاري (٦٣٠٧).

**واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی سوێند بێ بە زاتی الله من لە هەر ڕۆژێكا زیاتر لە حەفتا جار دەڵێم (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْك) (واتە داوای لێخۆشبوون و گەڕانەوە دەكەم لە خوای گەورە).**

**جا ئیمانداری بەڕێز ئەوە پێغەمبەرمانە ﷺ لە ڕۆژێكا حەفتا جار ئەمە دەڵێ ئەی ئێمەی گوناهبار دەبێت چەند جار ئەمە بڵێین؟؟؟.**

## خێری ووتنی (سبحان الله والله اكبر والحمدلله) لە پاش نوێژ

ﷺعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – وَهَذَا حَدِيثُ قُتَيْبَةَ أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالُوا ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالدَّرَجَاتِ الْعُلَى وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ. فَقَالَ « وَمَا ذَاكَ ». قَالُوا يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّى وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ وَيَتَصَدَّقُونَ وَلاَ نَتَصَدَّقُ وَيُعْتِقُونَ وَلاَ نُعْتِقُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « أَفَلاَ أُعَلِّمُكُمْ شَيْئًا تُدْرِكُونَ بِهِ مَنْ

سَبَقَكُمْ وَتَسْبِقُونَ بِهِ مَنْ بَعْدَكُمْ وَلَا يَكُونُ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكُمْ إِلَّا مَنْ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُمْ ». قَالُوا بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ « تُسَبِّحُونَ وَتُكَبِّرُونَ وَتَحْمَدُونَ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ ثَلَاثًا وَثَلَاثِينَ مَرَّةً ». رواه مسلم (١٣٧٥).

معاني بعض الكلمات:

(الدثور): جمع دثر؛ وهو المال الكثير، ويقع على: الواحد، والإثنين، والجمع.

(بالدرجات العلا): أي: إنهم حصَّلُوا الدرجات العلا، والنعيم المقيم وهو الجنة، بسبب حجهم وعمرتهم وجهادهم وصدقاتهم.

واتە: هەندێك لە هەژارە كۆچ بەرەكان هاتن بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتیان سەرمایەدارەكان پلەو پایەیان بەرزبویتەوە وە لە ناو خۆشیەكانی بەهەشتن (واتە بەهۆی حەج و عومرە كردنو خێرو..هتد. ئەمەش بە پارە دەكرێت بەڵام ئەوان هەژارن ناتوانن) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لەبەر چی؟ ووتیان ئێمە چۆن نوێژدەكەین ئەوانیش وەك ئێمە نوێژ دەكەن وە چۆن بەڕۆژی دەبین ئەوانیش وەك ئێمە بەڕۆژی دەبن ئەوان خێر دەكەن بەڵام ئێمە ناتوانین خێر بكەین وە كۆیلەش ڕزگاردەكەن بەڵام ئێمە ناتوانین پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی شتێكتان فێر نەكەم دەگەنە ئەو كەسانەی كە لەپێش ئێوە بوون (واتە لە پاداشت) وە بەپێش ئەو كەسانەش دەكەونەوە كە لە دواتان دێن وەهەرگیز كەس لە ئێوە باشتر نابێ مەگەر ئێوە چ دەكەن ئەوانیش وا بكەن، ووتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێمان بڵێ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پاش هەموو نوێژەكان سی و سێ جار بڵێن (سبحان الله والله اكبر والحمدلله).

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ وَقَالَ تَمَامَ الْمِائَةِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ ». رواه مسلم (١٣٨٠).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك لە دوای هەموو نوێژێکدا، (سیوسێ) جار بڵێ: (سُبْحَانَ الله) وە (سیوسێ) جار بڵێ: (اَلْحَمْدُ لِلّهِ) وە (سیوسێ) جار بڵێ: (اَللهُ أَكْبَرُ) وە بۆ تەواوکردنی (سەد) جارێکیش بڵێ: (لاإِلَهَ إِلاَّاللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ، هەرچەندە وەکو کەفی سەر دەریاش بێت.

## خێری ووتنی چوار ووشە بزانە کە خوای گەورە هەڵیبژاردووە

﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى مِنْ الْكَلَامِ أَرْبَعًا سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ فَمَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ كُتِبَ لَهُ عِشْرُونَ حَسَنَةً وَحُطَّ عَنْهُ عِشْرُونَ سَيِّئَةً وَمَنْ قَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ فَمِثْلُ ذَلِكَ وَمَنْ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَمِثْلُ ذَلِكَ وَمَنْ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ كُتِبَ لَهُ بِهَا ثَلَاثُونَ حَسَنَةً أَوْ حُطَّ عَنْهُ ثَلَاثُونَ سَيِّئَةً). رواه أحمد بن حنبل (٧٩٩٩) و النسائي (١٠٦٧٦) و ابن أبي شيبة مصنفه (٢٩٨٢٧).

(إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى مِنْ الْكَلَامِ أَرْبَعًا) فهي مختار الله من جميع كلام الآدميين. التيسير بشرح الجامع الصغير ج ١ ص٤٩٤.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە لەناو ووشەکان چواری هەڵبژاردوە (واتە هەموو ئەو ووشانەی کە نەوەی ئادەم بەکاری دەهێنێ) (١- سُبْحَانَ اللَّهِ ٢- وَالْحَمْدُ لِلَّهِ ٣- وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ٤- وَاللَّهُ أَكْبَرُ) جا هەر یەکێك ووتی (سُبْحَانَ اللَّهِ) ئەوە (٢٠) چاکەی بۆ دەنووسرێت وە (٢٠) گوناهی لەسەر لادەچێت، وە هەریەکێك بڵێ (الْحَمْدُ لِلَّهِ) بە هەمان پاداشتە، وە هەریەکێك بڵێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) بە هەمان پاداشتە، وە هەریەکێك بڵێ (اللَّهُ أَكْبَرُ) بە هەمان پاداشتە (واتە (٢٠) چاکە لەگەڵ لادانی (٢٠) گوناه)، وە هەریەکێك بڵێ (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) لە دەروونی خۆیدا ئەوە (٣٠) چاکەی بۆ دەنووسرێت وە (٣٠) گوناهی لەسەر لادەچێت.**

بۆ زیاتر زانین سەیری ئەم خشتەیە بکە ئەگەر یەکێك تەنها ڕۆژی (١٠) جار ئەمە بڵێ وە ئەگەر خوای گەورە یەك بە (دە )ی بۆ حیساب بکات: جا چاکەکانی بەم شێوە بۆ دەنووسرێت:

| ووتنی ١٠ جار ئەم زیکرانە لە ڕۆژێکدا بڵێ | چاکە لە ڕۆژێك | چاکە لە مانگێك | چاکە لە ساڵێك | چاکە لە ٢٠ ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| سُبْحَانَ اللَّهِ | ٢٠ × ١٠ = ٢٠٠ | ٢٠٠ × ٣٠ =٦٠٠٠ | ٦٠٠٠ × ١٢ =٧٢٠٠٠ | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ =١٤٤٠٠٠٠ |
| الْحَمْدُ لِلَّهِ | ٢٠ × ١٠ = ٢٠٠ | ٢٠٠ × ٣٠ =٦٠٠٠ | ٦٠٠٠ × ١٢ =٧٢٠٠٠ | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ =١٤٤٠٠٠٠ |
| لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ | ٢٠ × ١٠ = ٢٠٠ | ٢٠٠ × ٣٠ =٦٠٠٠ | ٦٠٠٠ × ١٢ =٧٢٠٠٠ | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ =١٤٤٠٠٠٠ |
| اللَّهُ أَكْبَرُ | ٢٠ × ١٠ = ٢٠٠ | ٢٠٠ × ٣٠ =٦٠٠٠ | ٦٠٠٠ × ١٢ =٧٢٠٠٠ | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ =١٤٤٠٠٠٠ |
| الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ | ٣٠ × ١٠ = ٣٠٠ | ٣٠ × ٣٠٠=٩٠٠٠ | ٩٠٠٠ × ١٢ =١٠٨٠٠٠ | ١٠٨٠٠٠×٢٠= ٢١٦٠٠٠٠ |

- به کەمترین کات و کار بەرەو لێخۆشبوونی پەروەردگار

بەڵام ئەم خەشتەی خوارەوە ئەگەر چاکە خوای گەورە یەك بە (٧٠٠) حیساب بکات:

| ووتنی ١٠ جار ئەم زیکرانە لە ڕۆژێکدا بڵێ | چاکە لە ڕۆژێك | چاکە لە مانگێك | چاکە لە ساڵێك | چاکە لە ٢٠ ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| سُبْحَانَ اللّٰهِ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| الْحَمْدُ لِلّٰهِ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| اللّٰهُ أَكْبَرُ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ | ٣٠ × ٧٠٠ = ٢١٠٠٠ | ٣٠ × ٢١٠٠٠ = ٦٣٠٠٠٠ | ١٢ ×٦٣٠٠٠٠ = ٧٥٦٠٠٠٠ | ٢٠×٧٥٦٠٠٠٠=١٥١٢٠٠٠٠٠ |

بۆ زیاتر زانین سەیری ئەم خشتەی خوارەوە بکە ئەگەر یەکێك تەنها ڕۆژی (١٠) جار ئەمە بڵێ وە ئەگەر خوای گەورە یەك بە (دە )ی بۆ حیساب بکات بۆ لادانی گوناهەکانی، جا گوناهەکانی بەم شێوەیە لە سەری لادەچێت:

| ووتنی ١٠ جار ئەم زیکرانە لە ڕۆژێکدا بڵێ | لادانی گوناهەکانی لە ڕۆژێك | لادانی گوناهەکانی لە مانگێك | لادانی گوناهەکانی لە ساڵێك | لادانی گوناهەکانی لە ٢٠ ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| سُبْحَانَ اللّٰهِ | ١٠ × ٢٠ ٢٠٠= | ٢٠٠ × ٣٠ ٦٠٠٠= | ٦٠٠٠ × ١٢ ٧٢٠٠٠= | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ ١٤٤٠٠٠٠= |
| الْحَمْدُ لِلّٰهِ | ١٠ × ٢٠ ٢٠٠= | ٢٠٠ × ٣٠ ٦٠٠٠= | ٦٠٠٠ × ١٢ ٧٢٠٠٠= | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ ١٤٤٠٠٠٠= |
| لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ | ١٠ × ٢٠ ٢٠٠= | ٢٠٠ × ٣٠ ٦٠٠٠= | ٦٠٠٠ × ١٢ ٧٢٠٠٠= | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ ١٤٤٠٠٠٠= |
| اللّٰهُ أَكْبَرُ | ١٠ × ٢٠ ٢٠٠= | ٢٠٠ × ٣٠ ٦٠٠٠= | ٦٠٠٠ × ١٢ ٧٢٠٠٠= | ٧٢٠٠٠ × ٢٠ ١٤٤٠٠٠٠= |
| الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ | ١٠ × ٣٠ ٣٠٠= | × ٣٠ ٩٠٠٠=٣٠٠ | ٩٠٠٠ × ١٢ ١٠٨٠٠٠= | =١٠٨٠٠٠×٢٠ ٢١٦٠٠٠٠ |

بەڵام ئەم خشتەی خوارەوە ئەگەر خوای گەورە گوناهەکانی لەسەر لابدات یەك بە (٧٠٠) بۆت حیساب بکات بە ووتنی هەر زیکرێك لەو زیکرانەی کە باسمان کردوە ئەوە بەم شێوەیە دەبێت:

| ووتنی ١٠ جار ئەم زیکرانە لە رۆژێکدا بڵێ | لادانی گوناهەکانی لە رۆژێك | لادانی گوناهەکانی لە مانگێك | لادانی گوناهەکانی لە ساڵێك | لادانی گوناهەکانی لە ٢٠ ساڵ |
|---|---|---|---|---|
| سُبْحَانَ اللّٰهِ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| الْحَمْدُ لِلّٰهِ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| اللّٰهُ أَكْبَرُ | ١٠ × ٧٠٠ =٧٠٠٠ | ٣٠ × ٧٠٠٠= ٢١٠٠٠٠ | ١٢ × ٢١٠٠٠٠ =٢٥٢٠٠٠٠ | ٢٠ × ٢٥٢٠٠٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ |
| الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ | ٣٠ × ٧٠٠ = ٢١٠٠٠ | ٣٠ × ٢١٠٠٠ = ٦٣٠٠٠٠ | ١٢ ×٦٣٠٠٠٠ = ٧٥٦٠٠٠٠ | ٢٠×٧٥٦٠٠٠٠=١٥١٢٠٠٠٠٠ |

جا ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر یەکێك ڕۆژانە (١٠٠) جار یاخود زیاتر ئەم زیکرانە بڵێ ئەوە بەو خشتانە دەتوانی بە شیوەیەکی نزیکی بۆ خۆی بزانی لە نووسینی چاکەو لادانی گوناه، جا با پەلە بکەین بۆ کۆکردنەوەی ئەم پاداشتانە وە لادانی گوناهەکانمان تا لە ژیاندا ماوین.

## ڕازیبوونی خوای گەورە بزانە لە ڕۆژی دوای بە ووتنی ئەم زیکرە

۞عَنْ أَبِي سَلَّامٍ عَنْ خَادِمِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ مَنْ قَالَ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا حِينَ يُمْسِي ثَلَاثًا وَحِينَ يُصْبِحُ ثَلَاثًا كَانَ حَقًّا عَلَى اللَّهِ أَنْ يُرْضِيَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه أحمد بن حنبل (١٨٩٦٧) و النسائي (١٠٤٠٠).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك بڵێ (رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا) کاتی ئێواران (سێ) جار وە کاتی بەیانیان (سێ) جار ئەوە حقە لەسەر خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی ڕازی بکا.

لە فەرموودەیەکی تر هاتووە:

۞ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ قَالَ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ ». رواه أبو داود (١٥٣١) و ابن حبان بترتيب ابن بلبان (٨٦٣).

وقوله: (وجبت له الجنَّة) أي: من مات على ذلك فلا بدَّ له من دخول الجنَّة قطعًا.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك بڵێ (رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً) بەهەشتی بۆ واجب دەبێت (واتە لەسەر ووتنی ئەم ووشانە بمرێت ئەوە بە دڵنیایی دەچێتە بەهەشت).

## خێری دوعا بزانە کە چ پاداشتی هەیە

❁عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم- « مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يَدْعُو لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ إِلاَّ قَالَ الْمَلَكُ وَلَكَ بِمِثْلٍ ». رواه مسلم (٧١٠٣).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر موسڵمانێك دوعا بۆ برای خۆی بکا لە پەنهانی بە دڵنیایی فریشتە دەڵێن بۆ تۆش هەروا (واتە: بۆ نمونە ئەگەر یەکێك منداڵی برایەکی نەخۆش بوو هی ویش نەخۆش بوو وا سوننەتە دوعا بۆ منداڵی برایەکەی بکات چونکە فریشتەکانیش دوعا بۆ منداڵی وی دەکەن).**

❁عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ - صلى الله عليه وسلم - يَقُولُ « مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِيْنَ وَالْمُؤْمِنَاتِ، كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً ». رواه الطبراني في مسند الشاميين (٢١٥٥). قال الهيثمي: اسناده جيد. ينظر في كتاب مجمع الزوائد ومنبع الفوائد ج ١٠ ص ٩١.

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرمووێ هەر یەکێك تکای لێخوش بوون بکات لە خوای گەورە بۆ ئیمانداران ئەوە خوای گەورە لە جیاتی هەر ئیماندارێك چاکەیەکی بۆ دەنووسی (جا موسڵمانی بەڕێز بزانە چەندەها ملیۆن ئیماندار هەبووە وەئیستاش هەیە).**

**هەروها خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز داوا لە پێغەمبەرەکەی (ﷺ) دەکات کە دوعا بۆئیمانداران بکات کە دەفەرمووێت :**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ (سورة طه ١٩).

هـەروەها پێغەمبـەر نـوح (ﷺ) دەیفـەرموو (رَّبِّ اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِيَ مُؤْمِناً وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ) [ سورة نوح ٢٨ ].

**ئاگاداری: لەم دوو ئایەتە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە یەکەم جار وا سوننەتە دوعا بۆ خۆت وخانەوادەکەت بکەی ئینجا بۆ ئیمانداران (واتە هەردوو ڕەگەز پیاو و ئافرەت).**

**ئاگاداری: ئیمانداری بەڕێز زۆر جاران دەبینین هەندێك لە موسڵمانان دەڵێن زۆر دوعامان کرد دوعامـان قبـووڵ نـابێ بـەڵام لـەم فەرموودەیـە پێغەمبـەرمان (ﷺ) بۆمان باس دەکات ئەگەر دوعای چاکە بکەین چمان بۆ دەبێ:**

۞ وروى عن النبي (صلى الله عليه وسلم): مَا مِنْ دَاعٍ يَدْعُو إِلَّا كَانَ بَيْنَ إِحْدَى ثَلَاثٍ إِمَّا أَنْ يُسْتَجَابَ لَهُ وَإِمَّا أَنْ يُدَّخَرَ لَهُ وَإِمَّا أَنْ يُكَفَّرَ عَنْهُ. موطأ امام مالك (٥٠٤) وينظر الي كتاب شرح صحيح البخاري . لابن بطال ج١٠ ص ١٠١

**واتە: هەریەکێك دوعای چاکە بکات بە دڵنیایی خوای گـەورە یـەکێك لـەم سـێ شتانە بوومان قبووڵ دەکات یەکەم: یا دوعاکەمان قبووڵ دەبێ، دووەم: یا دەبێت پاداشت لە ڕۆژی دوایی، سێ یەم: یا دەبێت سڕینەوەی گوناهەکان.**

## ڕێگاکانی چوونە بەهەشت بزانە

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا مِنْ النَّاسِ مُسْلِمٌ يَمُوتُ لَهُ ثَلَاثَةٌ مِنْ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلَّا أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ. رواه البخاري (١٣٨١). وفي رواية للبيهقي (٧٣٩٥) (وَيَكُونُونَ عَلَى بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ فَيُقَالُ لَهُمْ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ فَيَقُولُونَ حَتَّى يَجِيءَ أَبَوَانَا فَيُقَالُ لَهُمْ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَأَبَوَاكُمْ بِفَضْلِ رَحْمَةِ اللَّهِ »

لم يبلغ الحنث: لم يبلغ الحلم.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر موسڵمانێك (سێ) منداڵی بمرێ بەمەرجێك باڵغ نەبووبن ئەوە بە دڵنیایی خوای گەورە بۆ بەهەشتیان دەبا (واتە دایك و باوك )لەبەر سۆزوبەخشندەی خوای گەورە. وە لە فەرموودەیەکی تر هاتووە کە (بیهقی) بۆمان دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە دەفەرمووێ (منداڵەکان لە پێش یەکێك لە دەرگاکانی بەهەشت دەبن پێیان دەڵێن بڕۆن بۆ بەهەشت ئەوانیش دەڵێن تاکو دایك باوکمان نێن ناچین، پێیان دەڵێن، بڕۆن بۆ بەهەشت ئێوەو وباکو دایکتان لەبەر ڕەحمی خوای گەورە).**

۞ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ سَمِعْتُ أَبِي قَالَ سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ ذُكِرَ لِي أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لِمُعَاذٍ مَنْ لَقِيَ اللَّهَ لَا يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ قَالَ أَلَا أُبَشِّرُ النَّاسَ قَالَ لَا إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَّكِلُوا. رواه البخاري (١٢٩).

قوله: (من لقي الله) أي من لقي الأجل الذي قدره الله يعني الموت. كذا قاله جماعة، ويحتمل أن يكون المراد البعث أو رؤية الله تعالى في الآخرة. فتح الباري ج١ ص٢٢١.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بە (معاذ) فەرمووی هەریکێك بچێتە لیقای خوای گەورە (جا لیقایەکە چ بە مردن بێ یاخود لە ڕۆژی دوایی) هاوتای بۆ خوای گەورە پەیدا**

نـەكردبێت دەچـێتە بەهەشـت، ووتم مـوژدە بـە خـەڵك نـەدەم، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی نەخێر دەترسم پشت بەوە بەبەستن چيتر نەكەن.

۞عَنِ الْمَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا ذَرٍّ يُحَدِّثُ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ « أَتَانِى جِبْرِيلُ - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - فَبَشَّرَنِى أَنَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ ». قُلْتُ وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ. قَالَ « وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ ». رواه البخاري (١١٨٠) و مسلم (٢٨٢).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی جبريل (سەلامی خوای لەسەر بێت) هات لام موژدەی پێ دام ئەگەر هەر يەكێك لە ئومەتی تۆ بمرێت (شرك) هاوتـای بـۆ خـوای گەورە دانەنابێت دەچێتە بەهەشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر داوێن پيـسی و درزيشی كردەبێت، جبريل (سەلامی خوای لەسـەر بێـت) فـەرمووی ئەگـەر داوێـن پيسی و درزيشی كردەبێت (واتە هەردەچێتە بەهەشت).

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَجُلًا قَالَ لِلنَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْصِنِي قَالَ لَا تَغْضَبْ فَرَدَّدَ مِرَارًا قَالَ لَا تَغْضَبْ. رواه البخاري (٦١١٦).

واتە: پياوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی ئامۆژگاريم بكـە، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی تورەمەبە چەند جار داوای ئامۆژگـاری كـرد، پێغەمبـەر (ﷺ) ديفـەرموو تورەمەبە.

۞عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ، قَالَ: " لا تَغْضَبْ، وَلَكَ الْجَنَّةُ . رواه الطبراني في الاوسط (٢٣٥٣) :

واتە: ابو دەردا هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) کارێکم پێ نیشان بدە ئەگەر جێبەجێم کرد بچمە بەهەشت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی تورەمەبە بەهەشتت بۆ دەبێت.

ئیمانداری بەڕێز: بۆیە پێغەمبەر خوا (ﷺ) ئەم ئامۆژگاریەی کردینە جونکە هەموو شتێك لە پاش تورەبوون سەر هەڵدەدات وەك شەڕ و تەڵاق دان و کوشتن.. ...هتد.

بەڵام ئەو کەسانەی کە تورەبوونیان بەدەرناخەن لە ناخی خۆیان دەهێڵنەوە خوای گەورە مەدحییان دەکات هەر وەك لەم ئایتە دەفەرمووێ {وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ} [ آل عمران: ١٣٤].

واتە: ئەوانەی ڕقی بەتینی خویان دەخۆنەوە (واتە لە ناخی خۆیان دەهێلنەوە) وە خەڵك دەبوورن خوای گەورە خۆشیانی دەوێت، جا بزانە ئەگەر دەتەوێت خوای گەورە تۆی خۆش بوێ لە کاتی تورە بوون لە خەڵك ببورە.

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ إِلَّا مَنْ أَبَى قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَنْ يَأْبَى قَالَ مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبَى. رواه البخاري (٧٢٨٠).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئومەتەکەم هەموو دەچێتە بەهەشت تەنها ئەوەی کە نەیەوێت ووتیان ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ) کێ هەیە (بەهەشتی) نەوێت، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەوەی مل کەچو گوێڕایەڵیم بێت دەچێتە بەهەشت وە هەرکەسێك گوێڕایەڵیم نەکا ئەوە نایەوێت (واتە نایەوێت بچێتە بەهەشت).

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّ – صلى الله عليه وسلم – قَالَ « مَا مِنْ أَحَدٍ يُدْخِلُهُ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ ». فَقِيلَ وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ « وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي رَبِّي بِرَحْمَةٍ ». رواه مسلم (٧٢٩١).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هیچ یەکێك نییە بە کاروکردەوەی بچێتە بەهەشت، یەکێك ووتی تۆش ئەی پێغەمبەر خوا (ﷺ)، فەرمووی، منیش جگە لەوەی خوای پەروەردگار دامان نەپۆشی بەڕەحمی خۆی (واتە ئەگەر ڕەحم و سۆزی خوای گەورە نەبێت هیچ کەسێك ناچێتە بەهەشت بە کاروکردەوەی).

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ. رواه البخاري (٦٥٢).

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی پیاوێك بەرێگادا دەڕۆیشت کەلە دارێکی دڕکاوی بینیی لەسەر ڕێگا لایدا، خوای گەورە سوپاس گوزاری کرد وە لێی خۆش بوو.

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– « مَرَّ رَجُلٌ بِغُصْنِ شَجَرَةٍ عَلَى ظَهْرِ طَرِيقٍ فَقَالَ وَاللَّهِ لأُنَحِّيَنَّ هَذَا عَنِ الْمُسْلِمِينَ لاَ يُؤْذِيهِمْ. فَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ ». رواه مسلم (٦٨٣٦).

واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی پیاوێك بە ڕێگادا دەڕۆیشت کەلە دارێکی لە سەر ڕێگایەکە بوو، ووتی والله ئەمە لا دەدەم تاکو موسڵمانان تووشی ئازار نەبن، (بەم کارە) بە بەهەشتی شاد کرد.

موسڵمانی بەڕێز: بزانە بەس لادانی کەلە دار خێر نیە بەڵکو لادانی بەرد بێت یاخود لاشەی ئاژەڵی مرداربوو یاخود هەر شتێك کە ئازاری موسڵمانان بدات.

﴿۞﴾عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ عَنِ ال نَّبِىِّ - صلى الله عليه وسلم - قَالَ « لَقَدْ رَأَيْتُ رَجُلاً يَتَقَلَّبُ فِى الْجَنَّةِ فِى شَجَرَةٍ قَطَعَهَا مِنْ ظَهْرِ الطَّرِيقِ كَانَتْ تُؤْذِى النَّاسَ ». رواه مسلم (٦٨٣٧).

معانى بعض الكلمات:

(يتقلب في الجنة) أي يتنعم بملاذها او يمشي ويتبختر. التيسير بشرح الجامع الصغير ج ٢ ص ٥٧٤.

(قطعها من ظهر الطريق) قال النووي: أي يتنعم في الجنة بملاذها بسبب قطعة الشجرة من الطريق وإبعادها عنه (كانت تؤذي الناس) أي كانوا يتأذون بها. مشكاة المصابيح (١٩٢٢).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی پیاوێکی بەختەوەرم بینیی لەناو رزق و رۆزی وخۆشیەکانی بەهەشت دەسوڕایەوە ئەویش بە هۆی بڕینی کەلە دارێکی شۆڕ ببوەوە لە سەر ڕێگایێك خەڵکی ئازار دەدا.**

## خێری سەلام کردن بزانە

۞عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ ثُمَّ جَلَسَ فَقَالَ النَّبِيُّ -صلى الله عليه وسلم- « عَشْرٌ ». ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ. فَرَدَّ عَلَيْهِ فَجَلَسَ فَقَالَ « عِشْرُونَ ». ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ. فَرَدَّ عَلَيْهِ فَجَلَسَ فَقَالَ « ثَلاَثُونَ ». رواه ابو داود (٥١٩٧) و معجم الكبير (٣٩٠) وغيرهما.

**واتە: پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ)، وەلامی سەلاوەکەی داوە، ئینجا دانیشتن، ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (دە) ئینجا پیاوێکی تر هات ووتی (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ)، وەلامی سەلاوەکەی داوە، ئینجا دانیشتن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (بیست)، ئینجا پیاوێکی تر هات ووتی (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)، وەلامی سەلاوەکەی داوە، ئینجا دانیشتن، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (سیی) واتای (دە و بیست و سیی) چاکەیە بۆی دەنووسرێت.**

ووتنی سەلام ئەگەر لە (١٠) موسوڵمان بکەی لە یەك ڕۆژ جا ئەگەر یەك بە (١٠) دابنێین کەواتە: ١٠ × ١٠ = ١٠٠ چاکە لە ڕۆژێکدا:

بۆ زیاتر زانین سەیری ئەم خشتەی خوارەوە بکە:

| | | |
|---|---|---|
| ١- ووتـــني الـــسلام عليكم | ٢-ووتني السلام عليكم ورحمة الله | ٣-ووتـــني الـــسلام علـــيكم ورحمة الله وبركاته |
| ١٠×١٠=١٠٠ چاکە بە ڕۆژێك | ١٠×٢٠ = ٢٠٠ چاکە بە ڕۆژێك | ١٠× ٣٠ = ٣٠٠ چـــاکە بـــە ڕۆژێك |
| ١٠٠×٣٠ = ٣٠٠٠ چاکە بە یەك مانگ | ٢٠٠×٣٠=٦٠٠٠ چاکە بە یەك مانگ | ٣٠٠ × ٣٠ = ٩٠٠٠چـاکە بـە یەك مانگ |
| ٣٠٠٠×١٢ = ٣٦٠٠٠ چاکە بە ١ ساڵ | ٦٠٠٠×١٢=٧٢٠٠٠ چاکە بە ١ ساڵ | ٩٠٠٠×١٢=١٠٨٠٠٠چـــاکە بە١ساڵ |
| ٣٦٠٠٠ × ٢٠ = ٧٢٠٠٠٠ چاکە بە٢٠ ساڵ | ٧٢٠٠٠×٢٠=١٤٤٠٠٠٠چاکە بە ٢٠ساڵ | ١٠٨٠٠٠×٢٠=٢١٦٠٠٠٠ چاکە بە ٢٠ساڵ |

١- ٧٢٠٠٠ × ٧٠٠ = ٥٠٤٠٠٠٠٠ چاكەت بۆ دەنوسرێ بە ووتنی السلام علیكم لە (٢٠) ساڵ.

٢- ١٤٤٠٠٠ × ٧٠٠ = ١,٠٠٨,٠٠٠,٠٠٠ چاكەت بۆ دەنوسرێ بە ووتنی السلام علیكم ورحمە اللە لە (٢٠) ساڵ.

٣- ٢١٦٠٠٠ × ٧٠٠ = ١,٥١٢,٠٠٠,٠٠٠ چاكەت بۆ دەنوسرێ بە ووتنی السلام علیكم ورحمةالله **وبركاته لە (٢٠) ساڵ.**

۞عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَىَّ إِلاَّ رَدَّ اللَّهُ عَلَىَّ رُوحِى حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ ». رواه ابو داود (٢٠٤٣) و البيهقي (١٠٥٦٩) وغيرهما.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەكێك سەڵاوم لێ بكات (واتە بڵێت (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ يا رسول الله) ئەوە بە مسۆگەری خوای گەورە گیانم دەگەڕێنێتەوە لاشەم تاكو وەڵامی سەڵاوەكەی بدەمەوە.**

۞عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « لاَ تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى شَىْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ. رواه مسلم (٢٠٣).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ناچنە بەهەشت تاكو ئیمان نەهێنن و ئیمان ناهێنن تاكو یەكترتان خۆش نەوێ، پێتان بڵێم ئەگەر شتێك بكەن یەكترتان خۆش دەوێ، با سڵاو كردن لە نێوانتان بڵاوبێتەوە (واتە بەهەر موسڵمانێك گەیشتی سڵاوی لێ بكە).**

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ قَالَ تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ. رواه البخاري (١٢).

**واتە: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کرد چ ڕەوشتێکی موسڵمان خێرە ئەگەر جێبەجێی بکات؟ فەرمووی (خواردن ببەخشی وە سەلاو لە کەسێك بکەی کە بیناسی یا نەیناسی).**

۞عَنْ أَبِي سُفْيَانَ الْحِمْصِيِّ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِاللَّهِ مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلاَمِ ». رواه ابو داود (٥١٩٩) والبيهقي في شعب الإيمان (٨٧٨٧).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی باشترین کەستان لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کە دەست پێشخەربێت لە سەلام کردن.**

۞عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ عَنِ الْبَرَاءِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا ». رواه ابو داود (٥٢١٤) و الترمذي (٢٧٢٧).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەرکاتێك موسڵمانان بەیەك بگەن تۆقە لەگەڵ یەکتر بکەن بە دڵنیایی خوای گەورە لێیان خۆش دەبێت پێش ئەوەی لێك جیا ببنەوە.**

## خێری ناوەکانی خوای گەورە بزانە

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ. رواه البخاري (٢٧٣٦) و مسلم (٦٩٨٦).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە نۆهەدو نۆ ناوی لێیە هەر کەسێك بیانژمێری دەچێتە بەهەشت.**

**ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر دەتوێت بچی بۆ بەهەشت فەرموو ئەوە لەبەردەستە ناوەکان بیانژمێرە وە لەبەریان بکە وە هەوڵدە ماناکەشی بزانی، ئەمەش ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەیە:**

{ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ الْغَفَّارُ الْقَهَّارُ الْوَهَّابُ الرَّزَّاقُ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الْخَافِضُ الرَّافِعُ الْمُعِزُّ الْمُذِلُّ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ الْحَكَمُ الْعَدْلُ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ الْحَلِيمُ الْعَظِيمُ الْغَفُورُ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ الْحَفِيظُ الْمُقِيتُ الْحَسِيبُ الْجَلِيلُ الْكَرِيمُ الرَّقِيبُ الْمُجِيبُ الْوَاسِعُ الْحَكِيمُ الْوَدُودُ الْمُجِيبُ الْبَاعِثُ الشَّهِيدُ الْحَقُّ الْوَكِيلُ الْقَوِيُّ الْمَتِينُ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ الْمُحْصِي الْمُبْدِئُ الْمُعِيدُ الْمُحْيِي الْمُمِيتُ الْحَيُّ الْقَيُّومُ الْوَاجِدُ الْمَاجِدُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ الْقَادِرُ الْمُقْتَدِرُ الْمُقَدِّمُ الْمُؤَخِّرُ الْأَوَّلُ الْآخِرُ الظَّاهِرُ الْبَاطِنُ الْوَالِي الْمُتَعَالِي الْبَرُّ التَّوَّابُ الْمُنْتَقِمُ الْعَفُوُّ الرَّءُوفُ مَالِكُ الْمُلْكِ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ الْمُقْسِطُ الْجَامِعُ الْغَنِيُّ الْمُغْنِي الْمَانِعُ الضَّارُّ النَّافِعُ النُّورُ الْهَادِي الْبَدِيعُ الْبَاقِي الْوَارِثُ الرَّشِيدُ الصَّبُورُ }.

## بزانە لیقای خوای گەورە بۆ ئەو کەسەیە کە لیقای خوای پێخۆش بێ

عَنْ أَبِي مُوسَى عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ). رواه البخاري (٦٥٠٨) و مسلم (٦٩٩٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر کەسێك (لِقَاءَ) چاوپێکەوتنی خوای گەورەی پێخۆش بێ خوای گەورەش (لِقَاءَ) چاوپێکەوتنی وی پێخۆشە وە هەرکەسێك (لِقَاءَ) چاوپێکەوتنی خوای گەورەی پێ ناخۆش بێ خوای گەورە (لِقَاءَ) چاوپێکەوتنی وی پێ ناخۆشە.

## ئازاد بوون لە رۆژی مەحشر

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :"إِنَّ اللَّهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي لَهُ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ سِجِلًّا كُلُّ سِجِلٍّ مَدُّ الْبَصَرِ، فَيَقُولُ لَهُ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لَا يَا رَبِّ، فَيَقُولُ: بَلَى، إِنَّ لَكَ عِنْدِي حَسَنَةً، وَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ، فَيُخْرِجُ لَهُ بِطَاقَةً، فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَيَقُولُ: احْضُرْ وَزْنَكَ، فَيَقُولُ: مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ؟ فَتَثْقُلُ الْبِطَاقَةُ، وَلَا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْئًا". رواه الترمذي (٢٦٣٩) و أحمد (٦٩٩٤) والإمام عبد الله بن المبارك في مسنده (١٠٠).

(احْضُرْ وَزْنَكَ) أي: احْضُرْ وَزْنَ عَمَلِكَ. تحفة الأحوذي (ج ٦ ص٤٣٨).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە پیاوێك لە ئومەتی من ڕزگار دەکات کە نۆەد و نۆ (سجل) تۆماری لەسەر نوسراوە کە هەر (سجل) تۆمارێك بە ئەندازەی دوورترین شوێنە کەچاو دەیبینی، پێی دەفەرموێ ئایا هیچ لەم شتانە ڕەت دەکەیەوە؟ ئایا فریشتەکانم (ئەوانەی چاکە و خراپە دەنووسن) ستەمیان لێ کردی؟ دەڵێت نەخێر ئەی پەروەردگارە، خوای گەورە دەفەرمووێت بەڵام تۆ

چاکەیەکت لای من هەیە، لەبەر ئەوە ئەوڕۆ ستەمت لێ ناکرێ، جا کارتێکی بۆ دەردێنن لە سەری نووسراوە (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ ورَسُولُهُ)، خوای گەورە پێ دەفەرمووێ بڕۆ کاروکردەوەکانت ئامادەکە بۆ کێشان، جا دەڵێت ئەم کارتە وە ئەم (سجل) تۆمارانە چییە؟ جا کارتەکە گرانتر (واتە تەرازوی لای چاکەی گرانتر)دەبێت لەبەر ئەوەی هیچ شتێك کێشی نییە لەگەڵ ناوی خوای گەورە.

## چۆن چاو دەپارێزی لە ئاگری دۆزەخ

۞عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ عَيْنَانِ لَا تَمَسُّهُمَا النَّارُ عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ. رواه الترمذي (١٦٣٩) و البيهقي في شعب الإيمان (٧٩٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت دوو چاو هەنە ئاگری دۆزەخ نایانسوتێنێت، چاوەکیان گریابێت لەترسی خوای گەورە (واتە فرمێسك بڕێژی)، وە چاوێك پاسەوانی بکات لە موسڵمانان لە ڕێی خوای گەورە.

## ئەگەر توشی خەم و پەژارە هاتی ئەم دوعایە بکە

۞عَنْ الْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (ما قَالَ عَبْدٌ قَطُّ إِذَا أَصَابَهُ هَمٌّ وَحَزَنٌ اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أَمَتِكَ نَاصِيَتِي بِيَدِكَ مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي وَنُورَ صَدْرِي وَجِلَاءَ حُزْنِي وَذَهَابَ هَمِّي إِلَّا أَذْهَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَمَّهُ وَأَبْدَلَهُ

مَكَانَ حُزْنِهِ فَرَحًا) قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ يَنْبَغِي لَنَا أَنْ نَتَعَلَّمَ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ قَالَ (أَجَلْ يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهُنَّ أَنْ يَتَعَلَّمَهُنَّ). رواه احمد (٤٣١٨) و ابن أبي شيبة (٣٢٩).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی نیە هەر بەندەیەك ئەگەر توشی خەم و پەژارە بێ ئەوە بلێ (واتە ئەم دوعایە بکە) (اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أَمَتِكَ نَاصِيَتِي بِيَدِكَ مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ عَدْلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي وَنُورَ صَدْرِي وَجِلَاءَ حُزْنِي وَذَهَابَ هَمِّي) ئەوە بە مسۆگەری خوای گەورە خەم وپەژارەکانی دەگۆڕی بۆ دڵخۆشی، ووتیان ئەی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەرمانە ئەم ووشانە فێر بین پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بەڵێ ئەوەی گوێبیستی بێ دەبێ فێری بێت.

## خێری خۆشەویستی لە ڕاهی خوای گەورە بزانە

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (الْمَرْءُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلْ). رواه احمد (٨٤١٧) أبو داود (٤٨٣٥) و الترمذي (٢٣٨٧).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك لە ئێوە لەسەر ئاینی خۆشەویستەکانتانن، جا ببینن کە کێتان خۆش دەوێ (واتە ئەگەر خواو پێغەمبەر ئیماندارانت خۆش ویست ئەوە لەگەڵ ئەوان دەبی لە قیامەتدا وە ئەگەر زاڵم وستەمکارو کەسانی بێ بڕوات خۆش ویست لەگەڵ ئەوان دەبی لە قیامەتدا خوا پەنامان بدات ئامین).

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى السَّاعَةُ قَالَ « وَمَا أَعْدَدْتَ لِلسَّاعَةِ ». قَالَ حُبَّ اللَّهِ وَرَسُولِهِ قَالَ « فَإِنَّكَ

مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ ». قَالَ أَنَسٌ فَمَا فَرِحْنَا بَعْدَ الإِسْلاَمِ فَرَحًا أَشَدَّ مِنْ قَوْلِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- « فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ ». قَالَ أَنَسٌ فَأَنَا أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ فَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ مَعَهُمْ وَإِنْ لَمْ أَعْمَلْ بِأَعْمَالِهِمْ. رواه مسلم (٦٨٨١).

**واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی کەی ڕۆژی دواییە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی چیت بۆ ڕۆژی دوایی ئامادە کردوە، ووتی خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی تۆ لەگەڵ خۆشەویستەکانتی (واتە تۆ لە دونیا کێت خۆش دەوێ لە دوا ڕۆژ لەگەڵ ئەو دەبیت)، ئەنس دەڵێ ئێمە هیچ دڵمان وا خۆش نەبووە دوای ئیسلام بە خۆشیەکی زۆر وەك ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی تۆ لەگەڵ خۆشەویستەکانتی، ئەنس ووتی من خوا و پێغەمبەر (ﷺ) و ابابکر و عمرم خۆش دەوێت تکا کارم لەگەڵ ئەوانەبم هەر چەند کاروکردەوەشم وەك ئەوان نەبووە.**

۞عَنْ مُعَاذُ بن جَبَلٍ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: "قَالَ اللَّهُ " وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِّينَ فِيَّ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ، وَالْمُتَبَاذِلِينَ فِيَّ، وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ". رواه مالك (٣٥٠٧) و الحاكم (٧٣١٤) والطبراني في المعجم الكبير (١٦٥٧٥).

قال سئل أبو حمزة النيسابوري عن (المتحابين )في الله عز و جل من هم فقال العاملون بطاعة الله المتعاونون على أمر الله.

قال أحمد فحدثت به أبا سليمان الداراني فقال قد يعملون بطاعة الله ويتعاونون على أمره ولا يكونون إخوانا في الله حتى يتزاوروا ويتباذلوا فقال أحمد صدق الله قال أبو عمر معنى التباذل أن يبذل كل واحد منهما ماله لأخيه متى احتاج. الاستذكار ج ٨ ص ٤٥١.

**واتە: (معاذ) ووتی گوێم لە پێغەمبەر (ﷺ) بوو دەیفەرموو خوای گەورە فەرموویەتی (خۆشەویستی من واجب بووە بۆ ئەو کەسانەی کە لەبەرە من**

یەکتریان خۆش دەوێ (واتە کاروکردەوەیان لەسەر مل کەچکردنی فەرمانی خوای گەورەیە وە هاوکاری یەکتر دەکەن لەسەر فەرمانی خوای گەورە)، هەروها بۆ ئەوانەی لە دانیشتنگاکانیان باسی من دەکەن،وە بۆ ئەوانەی هاوکاری یەکتر دەکەن (واتە بە پارە هەر کامەیان پیویستی بە یەکتر بێت ئەوە پێی دەبەخشی)، هەروەها بۆ ئەو کەسانەی لە بەر من سەردانی یەکتر دەکەن.

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِى الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِى ظِلِّى يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّى ». رواه مسلم (٦٧١٣).

(يوم لا ظل إلا ظلي) أي لا يكون من له ظل كما في الدنيا والمراد أنه في ظله من الحر والوهج. التيسير بشرح الجامع الصغير ج١ ص٥٥٦.

قَالَ الْقَاضِي: ظَاهِره أَنَّهُ فِي ظِلّه مِنْ الْحَرّ وَالشَّمْس وَوَهَج الْمَوْقِف وَأَنْفَاس الْخَلْق قَالَ: وَهَذَا قَوْل الْأَكْثَرِينَ.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی دەفەرمووێت کا ئەوانەی کە لەبەرە من یەکتریان خۆشدەویست ئەوڕۆ ئەوان لە ژێر سێبەری خۆم سێبەریان لێدەکەم کە هیچ سێبەر نیە تەنها سێبەری من نەبێت (واتە ئەو سێبەرە وەك سێبەری دونیا نیە بەڵکو ئەو سێبەرە لە گەرماو تیشکی خۆر و ناخۆشیەکانی قیامەت دەتپارێزێت).**

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- «أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخًا لَهُ فِى قَرْيَةٍ أُخْرَى فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكًا فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ أَيْنَ تُرِيدُ قَالَ أُرِيدُ أَخًا لِى فِى

هَذِهِ الْقَرْيَةِ. قَالَ هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا قَالَ لاَ غَيْرَ أَنِّى أَحْبَبْتُهُ فِى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. قَالَ فَإِنِّى رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ». رواه مسلم (٦٧١٤).

معاني بعض الكلمات:

(أرصده) أقعده يرقبه.

(المدرجة) بفتح الميم والراء هي الطريق.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی پیاوێك سەردانی برایەكی كرد لە گوندێكی تر، خوای گەورە لەسەر ڕێگای ئەم پیاوە فریشتەیەكی دانابوو چاوەڕوانی دەكرد كاتی هاتە لای فریشتەكە پێی ووت بۆ كوێ دەچی، ووتی دەمەوێت بچمە لای برایەك لەو گوندەیە، ووتی هیچ چاكەیەكی لەسەرت هەیە تا چاكەكەی بدەیەوە، ووتی نا جگە لەوەی كە خۆشم دەوێ لەبەر خوای گەورە، ووتی من نێردراوی خوای گەورەم بۆ لای تۆ كە خوای گەورە تۆی خۆش ویستیە هەر چۆن لەبەروی كەسانێكت خۆش ویستیە.

۞عَنْ مُعَاذِ بن جَبَلٍ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، يَقُولُ الْمُتَحَابُّونَ فِي اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي ظِلِّ الْعَرْشِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ يَغْبِطُهُمْ بِمَكَانِهِمْ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ. رواه احمد (٢٢٧٨٢)

قوله (يَغْبِطُهُمْ بِمَكَانِهِمُ النَّبِيُّونَ) وهي تمني نعمة على ألا تتحول عن صاحبها. تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ج٧ ص ٥٦.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئەوانەی یەكتریان خۆش ویستیە (لەبەر خوای گەورە) لە ژێر سێبەری عەرشن كە ئەو ڕۆژەی هیچ سێبەر نیە تەنها سێبەری خوای گەورە نەبێت (واتە ئەو سێبەرە وەك سێبەری دونیا نیە بەڵكو ئەو سێبەرە لە گەرماو تیشكی خۆر و ناخۆشیەكانی قیامەت دەتپارێزێت)،

پێغەمبەرەکان و ڕاستگۆیەکان ئاواتی شوێنی وان دەخوازن بەڵام نەوەك لەسەرە وان لابچێ (ئەمە مانای ئەوە نیە ئەوان لە پێغەمبەرەکان بەڕێزترن چونکە ئەم سیفەتە زیاتر هی پێغەمبەرەکانە جا ئەوە تەنها لەبەر گەورەیی خوشەویستی یەکترە لە پێناوی خوای گەورە چونکە پێغەمبەرەکان خەڵکیان فێرکردوە چۆن لە پێناوی خوای گەورە یەکتریان خۆش بوێ کەوابوو ئەوان لەپێشترن لە هەموو کەسانی تر بۆ ئەم جێگایە کە لە بەهەشتە).

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ. رواه البخاري (١٣).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی سوێند بێ بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە، ئێوە ئیمان ناهێنن تاکو منتان لە دایەك و باوك و منداڵەکانتان خۆشتر نەوێت (کەوابوو ئیمانمان ئەو کاتە تەواو دەبێت کە پێغەمبەرمان (ﷺ) لە هەموو کەسێك خۆشتر بوێت جا ئەمە کارێکی گران نییە تا نەتوانین).

۞عَنْ أَنَسٍ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لَا يُحِبُّهُ إِلَّا لِلَّهِ وَأَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ. رواه البخاري (١٦).

قال العلماء رحمهم الله: معنى حلاوة الإيمان استلذاذ الطاعات وتحمل المشقات في رضى الله عز وجل. ومحبة العبد لخالقه هى التزام طاعته والانتهاء عن معاصيه لقوله تعالى: (قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ) [ آل عمران: ٣١ ].

وكذلك محبة رسول الله هى التزام شريعته واتباع طاعته. شرح صحيح البخارى ـ لابن بطال ج ١ ص ٦٦.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی سێ کەس هەیە تام و چێژی ئیمانیان بینیوە (واتە خۆیان ماندو کردووە بۆ ڕەزامەندی خوای گەورە)، (یەکەمیان) خواو پێغەمبەریان (ﷺ) لە هەموو کەس خۆشتر بوێت (واتە خۆشەویستی خواوپێغەمبەرەکەی (ﷺ) ئەوەیە کە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ)، (دووەمیان) کەسێکی خۆش بوێت باخۆشی نەوێت تەنها بۆ خوای گەورە نەبێت، (سێ یەمیان) با پێ ناخۆش بێت لە گەڕانەوەی بۆ بێ بڕوایی هەر وەکو ئەوەی پێ ناخۆش بێت کە فرێ بدرێت بۆ ناو ئاگر (واتە ئاگر چەند ناخۆشە ئەگەر خوانەخواستە بەسوتێ لە ناویدا با وا بزانی گەڕانەوەی لە ئیمانەوە بۆ کوفر بەم شێوەیە).

۞عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ قَالَ الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ. رواه البخاري (٦١٦٨).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئێوە لەگەڵ خۆشەویستەکانتانن (واتە لە دونیا کێت خۆش دەوێت لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەوان حەشر دەکرێی جا ئەگەر خواو پێغەمبەر (ﷺ) ئیماندارانت خۆشویست لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەوان دەبی بەڵام خوانەخواست کەسانی بێ بڕوات خۆشویست لە ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئەوان حەشر دەکرێی).

۞عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن حَسَنِ بن حَسَنٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " إِنَّ مِنْ مُوجِبَاتِ الْمَغْفِرَةِ إِدْخَالَ السُّرُورِ عَلَى أَخِيكَ الْمُسْلِمِ ". رواه الطبراني في المعجم الكبير (٢٧٣١) و الشهاب في مسنده (١١٣٩).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئەوەی دەبێتە هۆی لێخۆش بوونی خوای گەورە ئەوەیە کە خۆشی بخەیتە دڵی برای موسڵمانت.

## بزانە ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆشویست چی بۆ دەبێ

۞ حَدَّثَنَا زُهَيْرُ بْنُ حَرْبٍ حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ سُهَيْلٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ فَقَالَ إِنِّى أُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحِبَّهُ - قَالَ - فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ ثُمَّ يُنَادِى فِى السَّمَاءِ فَيَقُولُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحِبُّوهُ. فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ - قَالَ - ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِى الأَرْضِ. وَإِذَا أَبْغَضَ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ فَيَقُولُ إِنِّى أُبْغِضُ فُلاَنًا فَأَبْغِضْهُ - قَالَ - فَيُبْغِضُهُ جِبْرِيلُ ثُمَّ يُنَادِى فِى أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُبْغِضُ فُلاَنًا فَأَبْغِضُوهُ - قَالَ - فَيُبْغِضُونَهُ ثُمَّ تُوضَعُ لَهُ الْبَغْضَاءُ فِى الأَرْضِ ». رواه مسلم (٦٨٧٣).

شرح الحديث:

(إن الله إذا أحب عبدا دعا جبريل )قال العلماء محبة الله لعبده هي إرادته الخير له وهدايته وإنعامه عليه ورحمته وبغضه إرادته عقابه وشقاوته ونحوه وحب جبريل وملائكة يحتمل وجهين أحدهما استغفارهم له وثناؤهم عليه ودعاؤهم والثاني انه على ظاهره المعروف من الخلق وهو ميل القلب إليه واشتياقه إلى لقائه وسبب ذلك كونه مطيعا لله محبوبا له ومعنى يوضع له القبول في الأرض الحب في قلوب الناس ورضاهم عنه. الديباج على مسلم ج٥ ص٥٥١.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی خۆشویست (خۆشەویستی خوای گەورە بۆ بەندە ئەوەیە کە ڕەحمەو هیدایەتو چاکەیە) بە جبریل دەفەرمووێ من فلانم خۆش دەوێ تۆش خۆشت بوێ، فەرمووی، جبریلیش خۆشی دەوێ (خۆشەویستی فریشتە بە دوو واتە دێ یەکەکیان بەداوای لێ خۆش بوونە لای خوای گەورە بۆ کەسی بڕوادارو لەخواترسەکە دووەمیان وەك**

خۆشەویستی دڵە کە پێخۆش کەسی بڕوادارەکە ببینی لەبەر ئەوەی گوێڕایەڵی فەرمانی خوای گەورەیە)، ئینجا لەئاسمانەوە بانگدەکرێت دەڵێت خوای گەورە فلانی خۆش ویست ئێوەش خۆشتان بوێ، جا ئەوەی لە ئاسمانە خۆشیان دەوێ، فەرمووی، ئینجا ڕەزامەندی بۆ دادەنرێت لەسەر زەوی (واتە دەبێت خۆشەویستی خەڵك)، ئەگەر خوای گەورە ڕقی لە کەسێك بووەوە (ڕق و تورەی خوای گەورە ئەوەیە کە توشی سزاو دۆزەخی بکات) بە جبریل دەفەرمووێ من ڕقم لە فلانە تۆش ڕقت لێ بێتەوە، فەرمووی، جبریلیش ڕقی لێدەبێتەوە، ئینجا لەئاسمانەوە بانگدەکرێت دەڵێت خوای گەورە ڕقی لە فلانی بووەوە، فەرمووی، جا ئەوەی لە ئاسمانە ڕقیان لێ دەبێتەوە، ئینجا لەو کەسانە دەژمێردرێ کە ئەوەی لەسەر زەوی ڕقیان لێ ببێتەوە.

## بزانە نەخۆش چ ڕێزێکی هەیە لای خوای گەروە

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَا ابْنَ آدَمَ مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِى. قَالَ يَا رَبِّ كَيْفَ أَعُودُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ. قَالَ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِى فُلاَنًا مَرِضَ فَلَمْ تَعُدْهُ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَنِى عِنْدَهُ يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِى. قَالَ يَا رَبِّ وَكَيْفَ أُطْعِمُكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ. قَالَ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّهُ اسْتَطْعَمَكَ عَبْدِى فُلاَنٌ فَلَمْ تُطْعِمْهُ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ أَطْعَمْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِى يَا ابْنَ آدَمَ اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِى. قَالَ يَا رَبِّ كَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ قَالَ اسْتَسْقَاكَ عَبْدِى فُلاَنٌ فَلَمْ تَسْقِهِ أَمَا إِنَّكَ لَوْ سَقَيْتَهُ وَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِى». رواه مسلم (٦٧٢١).

معانى بعض الكلمات:

(مرضت فلم تعدني) أضاف المرض إليه والمراد العبد تشريفا له وتقريبا.

(أما علمت أنك لو عدته لو جدتني عنده) أي وجدت ثوابي وكرامتي.

وقال السبكي رضي الله عنه: سر ذلك أن المريض لا يروح إلى أحد بل يأتي الناس إليه فناسب قوله لوجدتني عنده. فيض القدير شرح الجامع الصغير ج ٣ ص ٢١٣.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەت دەفەرمووێ ئەی نەوەی ئادەم من نەخۆش بووم بۆ سەردانت نەکردم (ئەمە مانای ئەوە نیە کە خوای گەورە نەخۆش دەکەوی نەخێر پاك و بێگەردی بۆخوای گەورەیە بەڵکو ئەمە ڕێزوپایەی نەخۆشە لای خوای گەورە)، ووتی ئەی پەروەردگارە چۆن سەردانت بکەم کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی، خوای گەورە فەرمووی ئەی نەتدەزانی کە بەندەی من فلان نەخۆش بوو سەردانت نەکرد نەتدەزانی ئەگەر سەردانت بکردبایە منت لە لای وی دەدیتەوە (واتە پاداشت وڕێزلێنانی خوای گەورە لای نەخۆشە کاتی سەردانی بکەی)، ئەی نەوەی ئادەم داوای خواردنم لێکردی خواردنت پێ نەدام، ووتی ئەی پەروەردگارە چۆن خواردنت بدەمێ کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی (واتە ڕزق و ڕۆزی هەموو بوونەوەر لای تۆیە تۆ ڕەزاقی، ئێمە پێویستیمان بەتۆیە)، خوای گەورە فەرمووی ئەی نەتدەزانی کە بەندەی من فلان داوای خواردنی لێکردی خواردنت پێ نەدا ئایا نەتدەزانی ئەگەر خواردنت پێ دابا ئەوە لە لای منت دەدیتەوە (واتە پاداشتی خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی)، ئەی نەوەی ئادەم داوای ئاوم لێکردی ئاوت پێ نەدام، ووتی ئەی پەروەردگارە چۆن ئاوت بدەمێ کە تۆ پەروەردگاری جیهانیانی (واتە ئێمە داوات لێ دەکەین تۆ خاوەنی هەموو شتێکی)، خوای گەورە فەرمووی ئەی نەتدەزانی کە بەندەی من فلان داوای ئاوی لێکردی ئاوت پێ نەدا ئایا نەتدەزانی ئەگەر ئاوت پێ دابا ئەوە لە لای منت دەدیتەوە (واتە پاداشتی خوای گەورە لە ڕۆژی دوایی ئەوەیە کە هەرگیز تێنی نەدەکردی).

۞عَنْ عائشة رضي الله عنها عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (مَا مِن مُسلمٍ يُصابُ بِمصيبَةٍ - وَجَعٍ أَو مَرضٍ - إلا كَان كفَّارَةَ ذُنُوبِهِ حَتى الشَوكَةُ يُشاكُهَا أَو النَّكبةُ. البخاري في الأدب المفرد (٤٩٨ )و ابن ماجه (١٥٩٨ ).

(النَّكبِةُ) والمراد هنا ما يصيب الإنسان من الحوادث التي فيها جراح من غير العدو كوقوعه من على دابته.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی نیە هەر موسڵمانێك تووشی ناخۆشی یا ئازار یاخود نەخۆشی بێت بەدڵنیایی دەبێت داپۆشینی گوناهەکانی هەتاکو دڕکێك بچێت لاشەی یا بەهەر کارەساتێك (واتە وەك یەکێك تووشی بریندار بێت بە بێ شەڕ وەك بەر بوونەوە لە سەر ئەسپ، یا ڕووداوی سەیارە، یا لە ڕێگا کەوتن... هتد), بەمەرجێك لە کاری خراپە تووشی ئەم ئازارو ناخوشیە نەبێت.**

۞عَنْ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أَذًى شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا إِلَّا كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا). رواه البخاري (٥٦٤٨).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر موسڵمانێك بە دڕکێك ئازارێکی توش بێت یا لەوی زیاتر بێت (واتە لە ئازاری دڕك زیاتر بێت وەك لاشەی بریندار بێت بە چەقۆ یا بە ئامێرێك یا بەربێتەوە لە شوێنێك.. .. هتد کە ئەمانە هەمووی ئازاریان زیاترە لە دڕك) بەدڵنیایی خوای گەورە گوناهەکانی لەسەر لادەبات هەر وەکو چۆن دار پەلکی دەوەرێنی.**

۞عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قال سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ (إِذَا عَادَ الرَّجُلُ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ مَشَى فِي خِرَافَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسَ فَإِذَا جَلَسَ غَمَرَتْهُ الرَّحْمَةُ فَإِنْ كَانَ غُدْوَةً صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ وَإِنْ كَانَ مَسَاءً صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ). رواه أحمد بن حنبل (٦١٢) و ابن ماجه (١٤٤٢) و البزار (٦٢٠).
تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح وهذا إسناد رجاله ثقات رجال الصحيح.

معاني بعض الكلمات:

(خِرَافَة): أي في اجتناء ثمارها

(غمرته): أي علته وغطته وسترته.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئەگەر پیاوێک بچێتە لای نەخۆشێکی موسڵمان ئەوە لە ناو (خِرَافَةِ) بەهەشت دەڕوات (واتە بەروبوومی بەهەشت کۆدەکاتەوە) هەتاکو دادەنیشی کاتی دانیشت ڕەحمەی خوای گەورە دایدەپۆشی، جا ئەگەر بەیانی بوو (واتە سەردانی نەخۆشەکەی کرد) ئەوە حەفتا هەزار فریشتە دوعای بۆدەکەن تا ئێواریٚ، جا ئەگەر ئێوارە بوو (واتە سەردانی نەخۆشەکەی کرد) ئەوە حەفتا هەزار فریشتە دوعای بۆدەکەن تا بەیانی.**

۞عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ عَادَ مَرِيضًا لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مِرَارٍ أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ إِلاَّ عَافَاهُ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ الْمَرَضِ ». رواه أبو داود (٣١٠٨) و الحاكم في المستدرك (١٢٦٨).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك بچێتە لای نەخۆشێك کەئەجەلی نەهاتبیٚ ئینجا لای نەخۆشەکە حەوت جار ووتی** (أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ) **ئەوە بەدڵنیایی خوای گەورە شیفای نەخۆشەیەکەی دەدات کە تێدایە.**

## بزانە چۆن خۆت بەخوا دەپاریزی لەو ناخۆشیانەی کە دروستکراون

۞عَنْ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ وَهُوَ يَقُولُ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ قَالَ فِي أَوَّلِ يَوْمِهِ أَوْ فِي أَوَّلِ لَيْلَتِهِ بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ أَوْ فِي تِلْكَ اللَّيْلَةِ. رواه الإمام أحمد بن حنبل (٤٤٧).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەر یەکێك لە سەرەتای ڕۆژ بوونەوەی یان لە سەرەتای شەودا (سێ جار بڵێ) بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) هیچ شتێك زیانی پێ ناگەینێ لەو ڕۆژەدا یاخود لەو شەوەدا.**

۞عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعَوِّذُ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ وَيَقُولُ إِنَّ أَبَاكُمَا كَانَ يُعَوِّذُ بِهَا إِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ. رواه البخاري (٣٣٧١).

معاني بعض الكلمات:

(يعوذ) من التعويذ وهو الالتجاء والاستجارة.

(التامة) الكاملة في فضلها وبركتها ونفعها.

(هامة) كل حشرة ذات سم وقيل مخلوق يهم بسوء.

(لامة) العين التي تصيب بسوء وتجمع الشر على المعيون. وقيل هي كل داء وآفة تلم بالإنسان.

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) پارێزگاری لەحسن وحسین دەکرد دەیفەرموو باوکتان (واتە پێغەمبەر ابراهیم(ﷺ)بە ووتنی (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ ) پارێزگاری لە اسماعیل و اسحاقی دەکرد بە**

ووشەكانی خوای گەورە كە تەواون هیچ كەم و كوڕیان نیە لەهەموو شەیتانەكانو زیندەوەرە ژهراویەكان وە ئەوەی لەسەر زەوی دەڕوات وە لە هەموو چاو پیسێكی كاریگەر.

عَنْ سَعْدَ بْنَ أَبِى وَقَّاصٍ يَقُولُ سَمِعْتُ خَوْلَةَ بِنْتَ حَكِيمٍ السُّلَمِيَّةَ تَقُولُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَنْ نَزَلَ مَنْزِلاً ثُمَّ قَالَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ. لَمْ يَضُرُّهُ شَىْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ ». رواه مسلم (٧٠٥٣).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەكێك بچێتە هەر جێگایەك پاشان بڵێ (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) ئەوە هیچ شتێك زیانی پێ ناگەینی هەتاكو لەو جێگایە دەردەچێت.**

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِىِّ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَقِيتُ مِنْ عَقْرَبٍ لَدَغَتْنِى الْبَارِحَةَ قَالَ « أَمَا لَوْ قُلْتَ حِينَ أَمْسَيْتَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ لَمْ تَضُرَّكَ ». رواه مسلم (٧٠٥٥).

**واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوێنێ دوو پشكەك پێی وەدام پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر هاتوو ئەمەت ووتبا كاتی شەو (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) زیانی پێ نەدەگەیاندی.**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: "مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ. رواه الطبراني في الكبير (٢٨٤).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك بەیانیان و ئێواران بڵێ (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ) هیچ شتێك زیانی پێ ناگەینی.

## بزانە بەبینینی بەهەشت هەموو ناخۆشیەکان لەبیردەکەی

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « يُؤْتَى بِأَنْعَمِ أَهْلِ الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُصْبَغُ فِى النَّارِ صَبْغَةً ثُمَّ يُقَالُ يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ خَيْرًا قَطُّ هَلْ مَرَّ بِكَ نَعِيمٌ قَطُّ فَيَقُولُ لاَ وَاللَّهِ يَا رَبِّ.

وَيُؤْتَى بِأَشَدِّ النَّاسِ بُؤْسًا فِى الدُّنْيَا مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيُصْبَغُ صَبْغَةً فِى الْجَنَّةِ فَيُقَالُ لَهُ يَا ابْنَ آدَمَ هَلْ رَأَيْتَ بُؤْسًا قَطُّ هَلْ مَرَّ بِكَ شِدَّةٌ قَطُّ فَيَقُولُ لاَ وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا مَرَّ بِى بُؤْسٌ قَطُّ وَلاَ رَأَيْتُ شِدَّةً قَطُّ ». رواه مسلم (٧٢٦٦).

وقوله: يؤتى بأنعم اهل الدنيا، فيصبغ فى النار صبغة: أى يغمس ويغرق. إكمال المعلم شرح صحيح مسلم ج ٨ ص ١٧١.

(وَالْبُؤْس): الشِّدَّة

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی یەکێك دەهێنن کە لە دونیا لە خۆشترین ژیان بووە بەڵام لە ئەهلی ئاگرە لە ڕۆژی دوایی، ئینجا لە ناو ئاگر سەروژێری پێ دەکەن (واتە نوقمی ناو ئاگری دەکەن)، ئینجا پێی دەڵێن ئەی نەوەی ئادەم ئایا هیچ خێرت بینیوە! ئایا هیچ خۆشیەکت بەلا تێپەڕیە! دەڵێ نا واللە ئەی پەروەردگارە، یەکێکی تر دێنن کە لە دونیا لە ناخۆشترین ژیان بووە، بەڵام لە ئەهلی بەهەشتە، لەژێر نازو نیعمەتی بەهەشتدا دەسوڕێتەوە، ئینجا پێی دەڵێن ئەی نەوەی ئادەم ئایا هیچ خۆشیەکت بینیوە! ئایا هیچ ناخۆشیکت بەلا تێپەڕیە! دەڵێ نەخێر واللە ئەی پەروەردگارە، هیچ خۆشیەکم نەبینیوە، وە هیچ ناخۆشیەکم بەلا تێنەپەڕییە.

## داواکاریەکانی خوای گەورە بزانە بۆ بەندەکانی

عَنْ أَبِي ذَرٍّ عَنِ النَّبِيِّ - صلى الله عليه وسلم - فِيمَا رَوَى عَنِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَّهُ قَالَ « يَا عِبَادِى إِنِّى حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِى وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِى أَهْدِكُمْ يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاسْتَطْعِمُونِى أُطْعِمْكُمْ يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِى أَكْسُكُمْ يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا فَاسْتَغْفِرُونِى أَغْفِرْ لَكُمْ يَا عِبَادِى إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّى فَتَضُرُّونِى وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِى فَتَنْفَعُونِى يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِى مُلْكِى شَيْئًا يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِى شَيْئًا يَا عِبَادِى لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِى صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِى فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِى إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ يَا عِبَادِى إِنَّمَا هِىَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ ». رواه مسلم (٦٧٣٧).

معاني بعض الكلمات:

(قال الله تعالى يَا عِبَادِى) جمع عبد وهو شامل للإماء أي النساء بقرينة التكليف.

(إِنِّى حَرَّمْتُ) أي منعت (الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِى).

(وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا) أي حكمت بتحريمه عليكم وهذا وما قبله توطئة لقوله.

(فَلاَ تَظَالَمُوا) بشد الظاء وتخفف أصله تتظالموا أي لا يظلم بعضكم بعضاً

(يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ ضَالٌّ) أي غافل عن الشرائع قبل إرسال الرسل.

(إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ) وفقته للإيمان أو للخروج عن مقتضى طبعه.

(فَاسْتَهْدُونِى) سلوني الهداية (أَهْدِكُمْ) أنصب لكم أدلة واضحة على ذلك.

(يَا عِبَادِى كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ) لأن الخلق ملكه ولا ملك لهم بالحقيقة.

(فَاسْتَطْعِمُونِی) اطلبوا مني الطعام (أُطْعِمْكُمْ) أيسر لكم أسباب تحصيله.

(يَا عِبَادِی إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ) أي تفعلون الخطيئة عمداً.

(بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ) أي تصدر منكم الخطيئة ليلاً ونهاراً.

(وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا) عام مخصوص بالشرك وما شاء الله أن لا يغفره.

(فَاسْتَغْفِرُونِی) اطلبوا مني المغفرة (أَغْفِرْ لَكُمْ) أي امحو أثر ذنوبكم واسترها عليكم.

(لَكُمْ يَا عِبَادِی إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّی فَتَضُرُّونِی وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِی فَتَنْفَعُونِی) أي لا يتعلق بي ضر ولا نفع فتضروني أو تنفعوني لأني الغني المطلق والعبد فقير مطلق. التيسير بشرح الجامع الصغير ج٢ ص ٣٥٢.

(عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِی عَنِ النَّبِي (ﷺ): فِيمَا يَرْوِيهِ عَنِ رَبِّهِ تَعَالَى) **گێڕدراوەتەوە لە (ئەبو زەڕ)ی (غیفاری) خوا لێی ڕازی بێ، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەگێڕێتەوە، پێغەمبەریش (ﷺ) لە خوای گەورە ئەگێڕێتەوە.**

**(پێناسە) بزانە: بەم جۆرە حەدیسانە ئەگوترێ: (حەدیسی قودسی) واتە: حەدیسەکە ووشەو مانای لە لای خواوە هاتوە، بەڵام ناگاتە پلەی قورئان، وە حەدیسەکانی تری پێغەمبەر (ﷺ) مانای لە لای خواوە هاتوەو ووشەکەی هی پێغەمبەر (ﷺ).**

(أَنَّهُ قَالَ) **خوای گەورە فەرمووی:** (يَا عِبَادِی) **ئەی بەندەکانی من** (إِنِّی حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِی) **من ستەمو زۆرداریم لە سەر خۆم حەڕام کردوەو نایکەم** (وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا) **هەروەها ستەمو زۆرداری لە نێوان ئێوەشدا حەڕامم کردوەو** (فَلاَ تَظَالَمُوا) **کەواتە: ئێوەش ستەمو زۆرداری لە یەکتری مەکەن: وە ستەم لە خۆشتان مەکەن بە تاوان کردن.**

**بزانە: ستەمو زۆرداری: دەستدرێژی کردنە بۆ سەر ماف کەسێکی تر بە ناهەقو دوژمنایەتی، یان دەرچوونە لە سنوری خوا.**

(يَا عِبَادِی كُلُّكُمْ ضَالٌّ) **ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان سەرلێشێواونو نەشارەزان لە ئاینی ئیسلام** (إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ) **تەنها ئەو کەسە نەبێ: کە من بیخەمە**

سەر ڕێگای ڕاست(فَاسْتَهْدُونِي) کەواتە: ڕێگای ڕاست هەر لە من داوا بکەن (أَهْدِكُمْ) منیش شارەزای ڕێگای ڕاستتان ئەکەمو ئەتانخەمە سەر ڕێگای ڕاست.ئەی موسوڵمان، تەنها ڕێگای خواو پێغەمبەر ﷺ بگرەو بە دوای ڕێچکەکان مەکەوە؟ چونکە گومڕات ئەکەن، جگە لە خوا کەس ناتوانێ بتگەیەنێتە ڕێگای ڕاست، ئەوانەی تۆ دوایان ئەکەوی، وەکو تۆ سەر لێشێواون ئەگەر ڕێگای خواو پێغەمبەر (ﷺ) نەگرن.

(يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ جَائِعٌ) ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان برسین (إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ) تەنها ئەوانە نەبێ: کە من خواردنو خواردنەوەیان ئەدەمێ (فَاسْتَطْعِمُونِي) داوای خواردەمەنی هەر لە من بکەن (أُطْعِمْكُمْ) منیش ئەتاندەمێ، واتە: ڕێگای وەدەستهێنانی خواردنتان بۆ ئاسان ئەکەم.

ئەی موسوڵمانی برسیو هەژار: با هاوارت هەر بۆ قاپی خودا بێ، چونکە هەر کەسێکی تر -جگە لە خودا- داوای خواردنی لێ بکەی، ئەویش وەکو تۆ پێویستی بە خودایە.

(يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ عَارٍ) ئەی بەندەکانم ئێوە هەمووتان ڕووتن (إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ) تەنها ئەو کەسە نەبێ کە من بەرگی بکەم (فَاسْتَكْسُونِي) داوای بەرگ هەر لە من بکەن (أَكْسُكُمْ) منیش بەرگتان ئەدەمێ، واتە: ڕێگای وەدەستهێنانی بەرگو پۆشاکتان بۆ ئاسان ئەکەم.

(يَا عِبَادِي) ئەی بەندەکانم (إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ) ئێوە بە شەو و ڕۆژ گوناه ئەکەن (وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا) من ئەگەر حەز بکەم لە هەموو گوناهێك خۆش ئەبم جگە لە کافربوون (فَاسْتَغْفِرُونِي) داوای لێخۆشبوونی گوناه هەر لە من بکەن (أَغْفِرْ لَكُمْ)منیش لێتان خۆش ئەبم.

پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ: ﴿كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ﴾ رواهُ الترمذي (٢٤٩٩ )، هەموو ئادەمیزادان گوناهبارن، وە باشترینی گوناهباران تۆبەکارانن.

کەوابوو: ئەی موسوڵمان زوو تۆبە بکەو باری گوناه لە سەر خۆت لادە، بە دڵو زوبان (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ) بکە، واتـە: داوای لێخۆشبوونی گوناهم لـە خـودا ئەکـەم. بۆ ئەوەی خوا لێت خۆش بێو ڕزقت فراوان بکاو غەمت لاببا.

(يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضُرِّي فَتَضُرُّونِي) ئێوە ناگەنە ئەو ڕادەیە کە بتوانن زیان لە من بدەن (وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي) هـەروەها: ناشـگەنە ئـەو پلـەیـە کـە بتـوانن سودم پێبگەیەنن، واتە: ئـەو چاکانەی خـودا لەگـەڵ بەنـدەکانی خـۆی ئـەکا، لـە ترسی زیان لێدانی خۆی نیەو بۆ سود پێگەیاندنی خۆیشی نیە، بەڵکو بۆ قازانجی ئەوانە، چونکە زۆر لەگەڵیان بە ڕەحمە. (يَا عِبَادِي) ئـەی **بەنـدەکانم** (لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ) ئەگـەر لـە یەکـەم کەسـتانەوە تـا دواییتـان (وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ) بـە ئادەمیزادتانـەوەو بـە جنۆکەتانـەوە (كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ) هەمووتان بێنە سەر دڵی چاکترین مرۆڤ لە ئێوە، واتە: ببنە مرۆڤێکی لـەخواترس (مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا) ئەوە هیچ لە گەورەیی‌و دەسەلاتی من زۆرتر ناکا، وە سودی خواپەرستی بۆ خۆتانە. (يَا عِبَادِي) ئەی بەنـدەکانم (لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِـرَكُمْ) ئەگـەر لـە یەکـەم کەسـتان تـا دواییتـان (وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ) بـە ئـادەمیزادو جنۆکەتانەوە (كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ) هەموویان بێنـە سـەر دڵـی خراپترین مرۆڤ لە ئێوە، واتە: هەموو ببنـە پیـاوی خـراپ (مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا) ئەوەش هیچ لە گەورەیی‌و دەسـەلاتی مـن کـەم ناکاتـەوە، واتـە: ئێـوە خـوا بپەرستن، یان نەیپەرستن، بۆ خوایەتی خوا هـەروەك یەکـە.(يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ) ئـەی بەنـدەکانم ئەگـەر لـە یەکـەم کەسـتانەوە تـا دوایـین کەستان، بـە ئـادەمیزادو جنۆکـەوە (قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ) لـە دەشـتێکدا کـۆ ببنەوە (فَسَأَلُونِي) هەر کەسە داوای شـتێکم لێ بکـا (فَأَعْطَيْتُ كُلَّ وَاحِدٍ مَسْأَلَتَهُ) هـەر یەکە لەو هەموو خەڵکە د اواکراوەکەی خۆی بدەمێ (مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي) ئەوە هیچ لـە گەنجینـەی لای خـۆم کـەم ناکاتـەوە (إِلَّا كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ) تـەنها وەك دەرزی چەند کەم ئەکاتەوە (إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ) ئەگەر لە ناو دەریـای هـەڵێنی، واتـە: بە دەرزی ئاوی دەریا کەم نابێتەوەو گەنجینەی خوداش کەم نابێتەوە. (يَا عِبَادِي)

ئەی بەندەکانم (إِنَّمَا هِيَ) ئەو کردەوە چاکانەو خراپانە (أَعْمَالُكُمْ) کردەوەی خۆتانە (أُحْصِيهَا لَكُمْ)من فەرمانم داوەتە فریشتەکانم: سەرژمێری کردەوەکانتان بکەن (ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا) ئینجا لە ڕۆژی دوایی دا دەیدەمەوە دەستتانو پاداشو سزاتان ئەدەم بەگوێرەی کردەوەکانتان: (فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا) جا هەرکەسێك بینی لە ڕۆژی دوایی چاکەی هەیەو پاداشی چاکەی دراوە (فَلْيَحْمَدِ اللهَ) با سوپاسی خوا بکا کە یارمەتی داوە بۆ چاکە کردن (وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ) وە هەر کەسێك بینی بە پێچەوانەوە خراپەی هەبوو و سزای خراپەی درا (فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ) ئەوە با هەر خۆی بە تاوانبار دابنێو لۆمەی کەسی تر نەکا، چونکە بەخۆی لە ڕێگای خوای گەورە لایداوە.

بزانە: هەرچی ئیماندار بێو چاکەی هەبێ، ئەوە لە دونیاو قیامەت پاداشتی چاکەکانی ئەدرێتێ، بەڵام هەر کەسێك کافر بێ، ئەوە پاداشتی چاکەکانی هەر لە دونیا ئەدرێتێو بۆ قیامەت چاکەی نامێنێو بە هۆی خراپەکانی ئەچێتە دۆزەخ، لە هەموو خراپەکانی گەورەتر کافربوونە.

پێناسە: جنۆکە چینێکن خوا لە ئاگر دروستی کردون، وە بە هەموو وێنەیەك خۆیان ئەنوێنن، لە سەر وێنەی تایبەتیخۆیان کەس بە چاو نایانبینێ، ئەوان ئێمە ئەبینن، ژنو منداڵیان هەیەو کافرو موسوڵمانیان هەیە، شەیتان لە جنۆکە کافرەکانە.

ئینجا بزانە: خوای گەورە لەم حەدیسەدا هەڕەشەی کردوەو موژدەشی داوە، کەوابوو: هەرکەسێك بیەوێ لە هەڕەشەی خوا ڕزگاری ببێو بگاتە موژدەی خوا، هیچ کەمتەرخەمی ناکا لە خواپەرستی (عن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: عَنِ النَّبِيِّ (ﷺ): مَنْ خافَ أَدْلَجَ وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَاللهِ غالِيَةٌ أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَاللهِ الْجَنَّة) رواهُ الترمذي (٢٤٥٠ )، واتە: هەر کەسێك ترسی هەبێ شەوڕۆیی ئەکا، هەرکەسێك شەوڕۆیی بکا ئەگاتە شوێنەکەی خۆیو ئەحەسێتەوە، ئاگاداربن: کوتاڵی خوا زۆر بە نرخە، ئاگاداربن کوتاڵی خوا بەهەشتە. واتە: بە هەرزان نایفرۆشێ. (ڕوونکردنەوەی الاربعين النواويه ص ٧١- ٧٢ ).

## خێرى چاندنى دەغلْ و دان يا دارو درەخت بزانه

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ إِلَّا كَانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ. رواه البخاري (٢٣٢٠).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى نيە هەر موسڵمانێك دارێك بچێنى ياخود دغڵودان بچێنى، دەبێت خواردنى باڵندەيەك يا مرۆڤێك ياخود گيانلەبەرێك، بە دڵنياى دەبێتە چاكە بۆى (واتە بەخواردنى هەر دنكە گەنمێك ياخود مێوەجاتێك چاكەى بۆ دەنووسرێت).

## خێری ئارامگرتن لەسەر ناخۆشییەکان بزانە

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ مَرَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِامْرَأَةٍ تَبْكِي عِنْدَ قَبْرٍ فَقَالَ اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي قَالَتْ إِلَيْكَ عَنِّي فَإِنَّكَ لَمْ تُصَبْ بِمُصِيبَتِي وَلَمْ تَعْرِفْهُ فَقِيلَ لَهَا إِنَّهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَأَتَتْ بَابَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمْ تَجِدْ عِنْدَهُ بَوَّابِينَ فَقَالَتْ لَمْ أَعْرِفْكَ فَقَالَ إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى. رواه البخاري (١٢٨٣).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) بە گۆرستانێك تێپەڕی ئافرەتێکی بینی دەگریا پێی فەرموو تەقوای خوای گەورە بکە، ئارام بگرە (ئافرەتەکە) ووتی وازم لێ بێنە تۆ وەك من تووشی ئەم کارەساتە نەبووی نەی ناسی (کە ئەمە پێغەمبەر (ﷺ)، یەکێك پێی ووت ئەمە پێغەمبەر (ﷺ)، هاتە لای دەرگای(مالّی) پێغەمبەر (ﷺ) بینیی دەرگەوانی نیە ووتی نەم ناسی، پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو ئارام گرتن لە سەرەتای کارەساتەکەیە (واتە کاتی تووشی کارەساتێك دەبی دەبێ هەر ئەو کات بڵی انا لله وان اله راجعون ئینجا ئارام بگری چونکە پاداشتی خوای گەورە لەو کاتە زۆرە).

۞عَنْ صُهَيْبٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ ». رواه مسلم (٧٦٩٢).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی بەڕاستی کاری ئیماندار هەمووی سەرسوڕهێنەرە چاکەی بۆی هەیە بۆ هیچ کەسێك نییە تەنها بۆ ئیماندار نەبێت ئەگەر خۆشیەکی توش بوو سوپاسی خوای کرد ئەوە دەبێت خێروچاکە بۆی، وەئەگەر ناخۆشیەکی تووش بوو ئارامی گرت ئەوە دەبێتە خێرو چاکە بۆی.

۞عَنْ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « لاَ يَصْبِرُ أَحَدٌ عَلَى لأْوَائِهَا فَيَمُوتَ إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَفِيعًا أَوْ شَهِيدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا كَانَ مُسْلِمًا ». رواه مسلم (٣٤٠٥).

معاني بعض الكلمات:

(اللأواء ): الشدة وضيق العيش

(شَفِيعًا أَوْ شَهِيدًا) وإما أن تكون أو للتقسيم وبكون شهيدا لبعض أهل المدينة وشفيعا لباقيهم إما شفيعا للعاصين وشهيدا للمطيعين وإما شهيدا لمن مات في حياته وشفيعا لمن مات بعد. تنوير الحوالك شرح موطأ مالك ج١ ص٢٠١.

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك ئارام بگرێ لەسەر ناخۆشیەکانی ژیانی (واتە هەژاری و نەداری) ئینجا بمرێ بەدڵنیایی دەبمە تکاکاری (ئەگەر گوناهبار بێ) یا شاهێدی بۆدەدەم (ئەگەر مل کەچ بێ بۆ خواوپێغەمبەر (ﷺ) لە ڕۆژی قیامەت ئەگەر موسڵمان بێ.**

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِنَّ اللَّهَ قَالَ إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ. يُرِيدُ عَيْنَيْهِ. رواه البخاري (٥٦٥٣).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە دەفەرمووێ ئەگەر بەندەم تاقیکردەوە بە نەمانی هەردوو خۆشەویستەکەی (واتە چاوەکانی چونکە چاو خۆشەویسترین ئەندامە لە لاشە) جا ئارامی گرت لەسەر نەمانی (چاوەکانی) خوای گەورە لە جیاتی نەمانی چاوەکانی پاداشتی بەهەشتی پێدەدا.**

عَنْ عطاء بن أبي رَباحٍ قَالَ: قَالَ لي ابنُ عباسٍ رضي الله عنهما: ألا أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ؟ فَقُلْتُ: بَلَى، قَالَ: هذهِ المرْأَةُ السَّوداءُ أتتِ النَّبيَّ - صلى الله عليه وسلم - فَقَالَتْ: إنِّي أُصْرَعُ، وإنِّي أتَكَشَّفُ، فادْعُ الله تَعالَى لي. قَالَ: « إنْ شئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الجَنَّةُ، وإنْ شئْتِ دَعَوتُ الله تَعالَى أنْ يُعَافِيكِ » فَقَالَتْ: أصْبِرُ، فَقَالَتْ: إنِّي أتَكَشَّفُ فَادعُ الله أنْ لا أتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا. رواه البخاري (٥٦٥٢) ومسلم(٦٧٣٦).

واتە: عطاء ووتی ابن عباس پێ ووتم ناتەوێ یەك لە ئافرەتەکانی بەهەشتت پێ نیشان بدەم ووتم بەڵێ، ووتی ئەو ئافرەتە ڕەشە هاتە لای پێغەمبەر (ﷺ) ووتی من خووی دەگرم (واتە: صَرَع) وە جل وبەرگ لەبەر خۆم دادەکەنم (واتە لە کاتی خووەکە ئاگام لە خۆم نامینێ بۆیە وادەکەم)، دوعام لۆ بکە لای خوای گەورە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەگەر دەتەوێت ئارام بگری بەهەشتت بۆ هەیە (واتە لەسەر ئەو نەخۆشیە)، وە ئەگەر دەتەوێت دوعات بۆ دەکەم خوای گەورە شیفات بدات، ووتی ئارام دەگرم (واتە ڕازیمە بەو نەخۆشیە) ئینجا ووتی من کاتی خوو(صرع) دەمگرێت جل وبەرگ لەبەر خۆم دادەکەنم دوعام لۆ بکە لای خوای گەورە جل و بەرگ لەبەر خۆم دانەکەنم، جا پێغەمبەر (ﷺ) دوعای بۆ کرد (واتە پاش دوعای پێغەمبەر (ﷺ) ئافرەتەکە لە کاتی خووەکە جل و بەرگی لەبەر خۆی نەدەکردەوە).

## پاش خواردن و خواردنەوە چ بلێین باشە

۞عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا ». رواه مسلم (٧١٠٨) وغيره.

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە لەبەندەیەك ڕازی دەبێت كاتی خواردنێك دەخوات حەمدو سوپاسی خوای گەورە دەكات (واتە دەڵێت الحمدلله) یان خواردنەوەیەك دەخواتەوە حەمدو سوپاسی خوای گەورە دەكات (واتە دەڵێت الحمد لله).

جا موسڵمانی بەڕێز: ڕەحمو سۆزی خوای گەورە چەند گەورەیە بە ووشەیەك ڕەزامەندی خوای گەورە وەردەگریت جا تكا دەكەم لە كاتی خواردن و خواردنەوەیەك ووشەی (الحمدلله) لە یاد نەكەین بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خوای گەورە بە دەست بێنین، جا بزانە وا سوننەتە پیش خواردن و خواردنەوە بڵێن (بسم الله):

۞عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ كُنْتُ فِي حَجْرِ رَسُولِ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم فَقَالَ لِي « يَا غُلاَمُ سَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ ».رواه مسلم (٥٣٨٨)

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی بسم الله بكە ئینجا نان بخۆ بەڵام لای خۆت بخۆ(واتە هی پێش كەس مەخۆ كاتێ نان لەگەڵ یەكێك دەخۆی).

۞عَنْ سَهْلِ بن مُعَاذِ بن أَنَسٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ "مَنْ أَكَلَ طَعَامًا، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلا قُوَّةٍ، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ لَبِسَ ثَوْبًا، فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ

غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلا قُوَّةٍ، غَفَرَ اللَّهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ". رواه أبو داود (٤٠٢٥) و احمد (١٥٦٣٢) و الطبراني في المعجم الكبير (٣٨٩).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك خواردنێکی خوارد، ئینجا ووتی حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردەمەنیەی پێ بەخشیم وە ڕزق و ڕۆزی پێدام بەبێ هیچ هێزو توانای من، خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت، وە هەر یەکێك جل و بەرگێك لەبەر بکات، ئینجا ووتی حەمدو سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە منی داپۆشت وە ئەم جل و بەرگەی پێ بەخشیم بەبێ هیچ هێزو توانای من، خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت.

## خێری شەو هەڵسانەوە بزانە

بسم الله الرحمن الرحيم

{ وَمِنْ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ }. [الاسراء:٧٩]

۞عَنْ طَاوُسٍ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا قَامَ مِنْ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ قَالَ" اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْدُ لَكَ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ مَلِكُ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ وَوَعْدُكَ الْحَقُّ وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ وَقَوْلُكَ حَقٌّ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ وَمُحَمَّدٌ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ حَقٌّ اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَوْ لَا إِلَهَ غَيْرُكَ". رواه البخاري (١١٢٠).

واتە: کاتێ پێغەمبەر (ﷺ) شەو لەخەو هەڵدەستا بۆ شەو نوێژ دەیفەرموو: خوایە حەمد (سوپاسگوزاری )هەر شایستەی تۆیە، تۆ ڕاگری ئاسمانەکان و زەوی

وە ئەوەی لە هەردووکیاندا هەیە حەمدو ستایش هەر شایستەی تۆیە، تۆ خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی وە ئەوەی لە هەردووکیاندا هەیە حەمدو ستایش هەر شایستەی تۆیە، تۆ ڕووناکی ئاسمانەکان و زەوی وە ئەوەی لە هەردووکیاندا هەیە حەمد و ستایش هەر شایستەی تۆیە، تۆ پاشای ئاسمانەکان و زەوی حەمد و ستایش هەر شایستەی تۆیە، تۆ ڕاستی، وە پەیمانت ڕاستە، وە لیقای تۆ ڕاستە، وە فەرموودەکانت ڕاستن، وە بەهەشت ڕاستە، وە دۆزەخ ڕاستە، وە پێغەمبەران ڕاستن، وە محمد ڕاستە، وە ڕۆژی دوایی ڕاستە، خوایە موسڵمان بووم بە تۆ، وە ئیمانم پێ هێناوی وەپشتم بە تۆ بەستووە، وە بۆ لای تۆ گەڕامەوە وە لەبەر تۆ بەرەنگاریان بوومەوە، وە بەحوکمڕانی تۆ حوکمم کرد، لێم خۆش بە ئەوەی لەپێش و لە داهاتوە وە ئەوەی بە نهێنی و ئاشکرا کردوومە، تۆ هەر هەبووی لە سەرەتاو لە دواوەش هیچ خوایەك نییە تەنها تۆ نەبێت.

۞عَنْ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ مَنْ تَعَارَّ مِنْ اللَّيْلِ فَقَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ ثُمَّ قَالَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي أَوْ دَعَا اسْتُجِيبَ لَهُ فَإِنْ تَوَضَّأَ وَصَلَّى قُبِلَتْ صَلَاتُهُ. رواه البخاري (١١٥٤).

(من تعار) بتشديد الراء أي استقيظ.

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر کەسێك بە شەو لە خەو هەڵسا ووتی (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ الْحَمْدُ لِلَّهِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ) لە پاشان ووتی خوایە لێم خۆشبە یا دوعای کرد خوای گەورە (قبوڵ)ی دەکات، وە ئەگەر دەست نوێژی شوشت نوێژی کرد نوێژیەکەشی (قبوڵ) دەکات.**

۞عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ :"عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ، فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ، وَمَقْرُبَةٌ لَكُمْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ، وَمَنْهَاةٌ عَنِ الإِثْمِ، وَمَطْرَدَةُ الدَّاءِ عَنِ الْجَسَدِ". رواه الترمذي (٣٥٤٩) والطبراني في الكبير (٦١٥٤) و البيهقي في شعب الإيمان (٣٠٨٧).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك لە ئێوە با شەو هەڵسێتەوە (واتە بۆ شەو نوێژ کردن و قورئان خوێندن یاخود یادی خوای گەورە بکات) لەبەر ئەوەی ئەمە ڕێی پیاو چاکانی پێش ئێوەیە، وە نزیك بوونەوەتانە لە خوای گەورە، وە ڕەشکەرەوەی گوناهەکانە، وە دوورخەرەوەیە لە تاوان، وە دەرچوونی نەخۆشیە لە لاشە.**

## گەورترین ووشەکانی لێخۆش بوون بزانە

۞عَنْ شَدَّادُ بْنُ أَوْسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ (سَيِّدُ الِاسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ قَالَ وَمَنْ قَالَهَا مِنْ النَّهَارِ مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ وَمَنْ قَالَهَا مِنْ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ. رواه البخاري (٦٣٠٦).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: گەورەترین داوای لێخۆش بوون ئەوەیە کە بڵێی** (اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ) **پێغەمبەر فەرمووی (ﷺ) هەر یەکێك بە ڕۆژ ئەمە بڵێ بە بڕوایەکی تەواو، ئەگەر بمرێ لەو ڕۆژە ئەو کەسە بە ئەهلی بەهەشت دادەنرێت،**

وە هەر یەکێك بەشەو ئەوە بلێ بە بڕوایەکی تەواو ئەگەر بمرێ پێش ئەوەی بەیانی بکاتەوە ئەو کەسە بە ئەهلی بەهەشت دادەنرێت.

## خێری سیواککردن

۞عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَاكُ وَهُوَ صَائِمٌ مَالا أُحْصِي أَوْ أَعُدُّ. رواه البخاري (١٨٣١).

واتە: عامری کوڕی ربیعە دەڵێ پێغەمبەری خوام (ﷺ) دیت بە ڕۆژو بوو سیواکی زۆر دەکرد نەمدەتوانی بیانژمێرم.

۞وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (لَوْلا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ وُضُوءٍ) وَقَالَتْ عَائِشَةُ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ وَقَالَ عَطَاءٌ وَقَتَادَةُ يَبْتَلِعُ رِيقَهُ. رواه البخاري (١٩٣٣) وغيره.

معاني بعض الكلمات:

(أشق) أدخل عليهم المشقة والحرج.

(لأمرتهم) أمر إيجاب وإلزام وهذا دليل الاستحباب المؤكد.

(مطهرة) أي إن السواك ينظف الفم وينقيه ويقبل منه عبادته ويكثر له الأجر والمثوبة.

واتە: ابو هوریرە دەڵێ پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی ئەگەر نەبایە بارگرانی لەسەر ئومەتەکەم ئەوە فرمانم پێدەکردن بە سیواك کردن لە گەڵ هەموو دەست نوێژێکدا یان هەموو نوێژێك.

وە دایکی ئیمانداران عائیشە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت دەڵێ پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی سیواك کردن پاککرەوی دەمە وە ڕازیبوونی خوای گەورەشە (واتە بە سیواك کردن خوای گەورە کارو کردەوەش قبوڵ دەکات

وە پاداشتیشی زۆر دەکا). وە (عطا و قتادە)ە دەڵێن تفەکەی قووت دەدات (واتە ئەو ئاوەی بە سیواک دەبێت، کاتی لە ناو دەمیدا سیواکی پێ دەکرد).

۞عَنْ بْنِ عَبَّاسٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ أَتَوْا النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْ أُتِيَ فَقَالَ مَا لِي أَرَاكُمْ تَأْتُونِي قُلْحًا اسْتَاكُوا لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَفَرَضْتُ عَلَيْهِمْ السِّوَاكَ كَمَا فَرَضْتُ عَلَيْهِمْ الْوُضُوءَ. رواه احمد (١٨٣٥) و الحاكم في المستدرك (٥١٧).

معاني بعض الكلمات:

(القلح ): صفرة تعلو الأسنان من عدم التسوك.

(لولا أن أشق): أي لولا أن أثقل عليهم، من المشقَّة وهي الشِّدَّة.

واتە: هەندێك هاتنە لای پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی لەبەر چی وا بە ددان زەردی دێنە لام، سیواك بكەن ئەگەر نەبایە بارگرانی لەسەر ئومەتەكەم ئەوە فەرمانم پێ دەكردن بە كردنی سیواك لەگەڵ هەموو نوێژەكان (واتە نوێژە فەڕزەكان) هەر وەكو چۆن دەست نوێژ لەسەریان فەڕز كراوە (واتە چۆن نوێژ بەبێ دەست نوێژ نابێ بەهەمان شێوە دەست نوێژیش بەبێ سیواك نەبێت، دەمكردە فەڕز بەڵام بارگرانیە بۆیە نەمكردە فەڕز).

## بەترسان لەخوای گەورە لەگەڵ ڕووخۆشی دەچیتە بەهەشت

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ أَكْثَرَ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ الْأَجْوَفَانِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْأَجْوَفَانِ قَالَ الْفَرْجُ وَالْفَمُ قَالَ أَتَدْرُونَ أَكْثَرَ مَا يُدْخِلُ الْجَنَّةَ تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ. رواه الترمذي (٢٠٠٤) و الإمام أحمد بن حنبل (٩٦٩٦).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی زۆربەی ئەوانەی کە دەچنە دوزەخ بە هۆی (الْأَجْوَفَانِ) (واتە دوو بۆشایی یا کون) ووتیان ئەی پێغەمبەرخوا (ﷺ) (الْأَجْوَفَانِ) چییە؟ فەرمووی دەم و دامێنە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دەزانن زۆربەی ئەوانەی کە دەچنە بەهەشت بە چ دەچن؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی تەقواکردنی خوای گەورەیە لەگەڵ ڕوو خۆشی (واتە هەردەم ڕووخۆش و دەم بە زردە خەنەیە وە گوفتاری خۆشە لە کاتی قسەکردن توڕەو توند نییە).

جا ئیمانداری بەڕێز: بزانە کە ڕێگای بەهەشت چەند ئاسانە ئەم فەرموودە چەند گران بەهایە بۆ ئەو کەسەی کە تێ بگا و کاری پێ بکا وەهەروەها بۆ خۆپاراستن لە دۆزەخ کارێکی قورس نیە کە نەتوانین دەم و دامێنمان لێ نەپارێزین، جا دەتوانین دەممان بۆ کاری خراپ بەکار نەهێنین تا موسڵمانانی پێ ئەزیەت نەدەین چونکە ئەگەر لەو دونیایەش ڕزگارمان بێت لە قیامەت چۆن وەڵامی خوای گەورە دەدەینەوە، وەهەروەها بۆ خۆپاراستنی دامێنمان دەتوانین ژن بێنین، بەڵام ئەگەر نەتوانین ژن بێنین وا باشە بەرۆژو بین بۆ خوای گەورە تا ئەوکاتەی خوای گەورە دەرگای ڕەحمەتمان لێ دەکاتەوە تا ژیانی هاوسەری پێکبێنین، جا داواکارین لە خوای گەورە دەم و دامێنمان بەپارێزی لە کاری نارەوا ئامین.

## کەفارەتی دانیشتن کە قسەی ناڕەوای تێدا بووترێ

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: "مَنْ جَلَسَ مَجْلِسًا كَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ: سُبْحَانَكَ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، كَانَ كَفَّارَةٌ لِمَا كَانَ فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ". رواه احمد (١٠٤١٥) و البيهقي في شعب الإيمان (٦٢٨) و الطبراني في الأوسط (٦٥٨٥).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك دانیشت لە دانیشتگایەك ووتەی ناڕەوای زۆر تێدا کرا، با پێش ئەوەی هەڵسێ بڵێ (سُبْحَانَكَ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) دەبێتە کەفارەتی ئەو دانیشتنەی کە قسەی ناڕەوای تێدا ووتراوە.**

## ئەگەر لەناو جێگاش بمری پلەی شەهیدی وەردەگری بەمەرجێك

۞عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ حَدَّثَهُ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللَّهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ ». رواه مسلم (٥٠٣٩).

**واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەریەکێك بەڕاستی داوای شهیدی بکا ئەوە خوای گەورە بە پلەی شەهیدی دادەنێ ئەگەر لە ناو جێگاش بمرێ.**

## خێرو پاداشتی مردووشۆر و کفن و ناشتن

**موسڵمانی بەڕێز: جا ئەگەر بزانی خێرو پاداشتی شۆردن وکفن وناشتن چەندە بڕواناکەم ئەوەی ژیر بێت ئەم خێرە لە دەستی خۆی بدات لە دەربارەی ئەم کارە چەند فەرموودەی دڵخۆشکەری هەیە بەڕاستی گرانبەهایە.**

۞عَنْ عَلِيِّ بْنِ رَبَاحٍ اللَّخْمِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا رَافِعٍ يُحَدِّثُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ: مَنْ غَسَّلَ مُسْلِمًا فَكَتَمَ عَلَيْهِ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ أَرْبَعِينَ مَرَّةً، وَمَنْ حفر لَهُ فَأَجَنَّهُ أَجْرَى عَلَيْهِ كَأَجْرِ مَسْكَنٍ أَسْكَنَهُ إِيَّاهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كَفَّنَهُ كَسَاهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ سُنْدُسٍ وَإِسْتَبْرَقِ الْجَنَّةِ. رواه البيهقي في الكبير (٦٩٠٠).

واته: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی هەرکەسێ مردووێك بشوا ئەگەر عەیب وکەم و کوڕیەك بەلەشیەوە هەبوو بیشارێتەوە لای خەڵك باسی نەکا خوای میهرەبان چل جار لێیخۆش دەبێ (لە فەرموودەکی تر هاتووە لە چل گوناهی گەورەی خۆش دەبی)، وە هەر کەسێك گۆڕێك بۆ یەکێك لێدا وە ژێر خاکی بکات پاداشتەکەی وەك ئەوەیە خانووێك بە خێر بدات بەیەکێك تا ڕۆژی کۆتایی، وە هەر کەسێك مردووێك کفن بکات خوای گەورە لە ڕۆژی دوای جل وبەرگی (سوندس) و (استبرەق)ی بەهەشتیانی لەبەردەکا.

هەروەها لە فەرموودەکی تردا هاتووە.

۞عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-« مَنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّىَ عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ ». قِيلَ وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ « مِثْلُ الْجَبَلَيْنِ الْعَظِيمَيْنِ ». رواه البخاري (١٢٦١) ومسلم (٢٢٣٢) وغيرهما.

واته: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتی هەرکەسێ لەلای تەرمێك ئامادەبێ تاوەکو نوێژی لەسەردەکرێ بە ئەندازەی یەك (قیراط) خێری بۆ دەنوسرێ وە هەرکەسێ لەلای ئامادەبی تا وەکو دەنێژرێ خێری دوو (قیراط )ی بۆ دەنوسرێ هاوەڵەکان پرسیاریان کرد دوو (قیراط) چەندە ئەی پیغەمبەری خوا؟ فەرمووی بە ئەندازەی دوو شاخی گەورەن، هەروەها چەندەها فەرموودەی تر هەیە کە باس ئەو خێرە نۆرانە دەکات ئەگەر ئێمە ئەم کارە ئەنجام بدەین".

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- يَقُولُ « مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً لاَ يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ شَفَّعَهُمُ اللَّهُ فِيهِ ». رواه مسلم (٢٢٤٢).

واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر پیاوێکی موسڵمان بمرێ چل پیاو نوێژی جەنازەی لەسەر بکەن بەمەرجێك هاوتای (واتە شریکی) بۆ خوای گەورە پەیدا نەکردبێ بە دڵنیایی خوای گەورە تکاکەیان (واتە شەفاعەتیان) لەسەر مردووەکە قبووڵ دەکات.

## خێری یارمەتی هەژاران بزانە

عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- « مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِى الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِى الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَاللَّهُ فِى عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِى عَوْنِ أَخِيهِ وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ ». رواه مسلم (٧٠٢٨).

معاني بعض الكلمات:

(نفس): أزال وفرج.

(كربة ): شدة عظيمة، وهي ما أهم النفس، وغم القلب.

(ومن يسر على معسر): بإنظاره إلى الميسرة، أو بإعطائه ما يزول به إعساره ،أو بالوضع عنه إن كان غريما.

(يسر الله عليه ): أموره ومطالبه.

(ومن ستر مسلما): بأن علم منه وقوع معصية فيما مضى، لم يخبر بها أحدا.

(ستره الله في الدنيا والآخرة): بألا يعاقبه على ما فرط منه.

(من سلك طريقا): بالمشي بالأقدام إلى مجالس العلم، ويتناول أيضا الطريق المعنوي: كالحفظ والمذاكرة والمطالعة والتفهم.

(يلتمس ): يطلب.

(علما ): شرعيا، قاصدا به وجه الله تعالى.

(سهل الله له طريقا إلى الجنة): بتيسير ذلك العلم الذي طلبه والعمل بمقتضاه أو علوم أخرى توصله إلى الجنة، ويحتمل أن يراد به تسهيل طريق الجنة الحسي يوم القيامة وهو الصراط.

(من بيوت الله ): المساجد.

(السكينة ):الطمأنينة والوقار. التحفة الربانية في شرح الأربعين حديثا النووية (٣٦ )

(يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ) والتدارس قراءة بعضهم على بعض تصحيحا لألفاظه أو كشفا لمعانيه كذا قاله ابن الملك ويمكن أن يكون المراد بالتدارس المدارسة المتعارفة بأن يقرأ بعضهم عشرا مثلا وبعضهم عشرا آخر وهكذا فيكون أخص من التلاوة أو مقابلا لها والأظهر أنه شامل لجميع ما يناط بالقرآن من التعليم والتعلم إلا نزلت. مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح ج ٢ ص١٠٥.

(وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ) يعني في الملائكة المقربين. فيض القدير شرح الجامع الصغير ج ٥ ص ٤٩٤.

(وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَله لَمْ يُسْرِع بِهِ نَسَبه )مَعْنَاهُ: مَنْ كَانَ عَمَله نَاقِصًا، لَمْ يُلْحِقهُ بِمَرْتَبَةِ أَصْحَاب الْأَعْمَال، فَيَنْبَغِي أَلَّا يَتَّكِل عَلَى شَرَف النَّسَب، وَفَضِيلَة الْآبَاء، وَيُقَصِّر فِي الْعَمَل.

واته: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك خەمو پەژارەیەکی ناخۆش لە سەر یەکێك لا بدات (وەك نەخۆشیەك پێویستی بە یارمەتی هەبوو چ بە پارە یان بە خوێن بەخشین.. ....هتد) لە دونیا، ئەوە خوای گەورە لە خەمو پەژارو

ناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی دەیپارێزی، وە هەر یەکێك بیێتە بار سووکی بۆکەسێك کە باری نا لەباربێت (واتە کەسێك قەرزدار بوو نەیدەتوانی قەرزەکەی هەموو بداتەوە یەکێك یارمەتیبدات قەرزەکەی لەسەر سووك بکات....هتد) ئەوە خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژ کار ئاسانی بۆ دەکات بۆ داواکانی، وە هەریەکێك گوناه وکەموکوڕی موسڵمانێك نەدرکێنی (واتە بە خەڵکی نەووت) ئەوە خوای گەورە لە دونیاو دوارۆژ گوناهەکانی دادەپۆشی (واتە خوای گەورە سزای نادات بەو تاوانانی کە ئەنجامی داوە )، وەخوای گەورە یارمەتی بەندە دەدات کاتی بەندە یارمەتی برای دەدات، وە هەر یەکێك ڕێگای زانست وەرگرتن بگرێتە بەر (واتە بۆ فێر بوونی شەریعتی ئیسلامی) ئەوە خوای گەورە ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، وە کۆبونەوەی هەر کەسانێك لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوای گەورە (واتە مزگەوتەکان) قورئان بۆ یەکتر دەخوێنن و باسیش دەکەن (واتە یەکتری فێرە قورئان خویندن دەکەن لە گەڵ تەفسیری قورئان) وە یان هەریەکە چەند ئایەتێك دەخوێنێت تاکو بۆ یەکتر ڕاست کەنەوە ئەگەر هەڵەیان هەبوو وە لە بیرنەکەن، ئەوە بەدڵنیایی فریشتەکان باڵی سۆز و میهرەبانیان بەسەریاندا دەکێشی وە بارانی ئارامی بەسەر دڵیان دێت وە خوای گەورە لای ئەوانەی کە لە لایەنە ناویان دێنی (واتە فریشتە نزیکەکان ئەمەش وەك ڕێزلێنانە بۆ بەندە کاتێ یادی خوای گەورە دەکەن جا هەر کەسێك دەیەوێت ناوی بیێنن با زۆر قورئان بخوێنی)، وە هەر یەکێك کردەوەی چاکەی کەم بوو ئەوە بە هۆی عەشیرەتو یاخود باوکی (واتە با باوکی کەسێکی خوایی بێت) سوودی بۆ نابێ ئەگەر کاروکردەوەی خراپ بوو (کەوا بوو نابێ دڵمان بەوە خۆش بێت کە باوەکمان مەلایە یا شێخە یاخود سەیدە بەڵکو دەبێت کردەوەمان چاك بکەین تاکو لە دوارۆژ ڕزگارمان بێت).

## خێری چوونە بازار بزانە

۞عَنْ وَاسِعٍ قَالَ قَدِمْتُ مَكَّةَ فَلَقِيَنِي أَخِي سَالِمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ فَحَدَّثَنِي عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ (مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فَقَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ وَبَنَى لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ). رواه الترمذي (٣٤٢٨) و ابن ماجه (٢٢٣٥).

**واتە: پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی هەر یەکێك کاتێ بچێت بۆ بازاڕ بڵێ (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لَا يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير) خوای گەورە (ملیۆن) چاکەی بۆ دەنوسێ وە (ملیۆن) گوناهی لە سەر لا دەبات وە (ملیۆن) پلەوپایە بەرزی دەکاتەوە وە کۆشکێکی بۆ دروست دەکات لە بەهەشت.**

**جا موسڵمانی بەڕێز :**

**باسی یەکێك دەکەین کە ڕۆژێ یەك جار بچێت بۆ بازاڕ بەمەرجێك خەڵك ئەزیەت نەدا، نەزەر نەکات، تانج لە خەڵك نەدا واتە بۆ کاری پێویست بچێت نەك بۆ گوناە کردن جا سەیری ئەم خشتەی سەروە بکە:**

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١– نووسینی چاکە | ١٠٠٠٠٠٠ چاکە لە یەک ڕۆژ | ١٠٠٠٠٠٠ × ٣٠ = ٣٠٠٠٠٠٠٠ چاکە لە مانگێك | ٣٠٠٠٠٠٠٠×١٢= ٣٦٠٠٠٠٠٠٠ چاکە لە ساڵێك | ٣٦٠٠٠٠٠٠٠ ×٢٠= ٧٢٠٠٠٠٠٠٠٠ چاکە لە ٢٠ساڵ |
| ٢– سڕینەوەی گوناە | ١٠٠٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناە لە یەک ڕۆژ | ١٠٠٠٠٠٠ × ٣٠ = ٣٠٠٠٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناە لەمانگێك | ٣٠٠٠٠٠٠٠×١٢= ٣٦٠٠٠٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناە لە ساڵێك | ٣٦٠٠٠٠٠٠٠ × ٢٠= ٧٢٠٠٠٠٠٠٠٠ سڕینەوەی گوناە لە ٢٠ ساڵ |
| ٣– بەرزبوونەوەی پلەوپایە | ١٠٠٠٠٠٠ بەرزبوونەوەی پلەوپایە لە یەک ڕۆژ | ١٠٠٠٠٠٠ × ٣٠ = ٣٠٠٠٠٠٠٠ بەرزبوونەوەی پلەوپایە لە یەک مانگێك | ٣٠٠٠٠٠٠٠×١٢= ٣٦٠٠٠٠٠٠٠ بەرزبوونەوەی پلەوپایە لە ساڵێك | ٣٦٠٠٠٠٠٠٠× ٢٠= ٧٢٠٠٠٠٠٠٠٠ بەرزبوونەوەی پلەوپایە لە ٢٠ ساڵ |
| ٤– دروست کردنی کۆشك لە بەهەشت | یەک کۆشك لە بەهەشت لە یەک ڕۆژ | ٣٠×١ = ٣٠ کۆشك لە بەهەشت لە مانگێك | ٣٠ ×١٢= ٣٦٠ کۆشك لە بە هەشت لە ساڵێك | ٣٦٠ × ٢٠ =٧٢٠٠ کۆشك لە بەهەشت لە ٢٠ساڵ |

لەكۆتايدا: لە خواى گەورە داواكارم بۆ ئەو كەسانەى كە يارمەتيوهاوكاريان كردم خواى گەورە لە گوناهيان خۆشبێ وە ببێتە مايەى پاداشتى رۆژى دوايى وە لەگەڵ خۆشەويستمان محمد (ﷺ) حەشرمان بكات ئامين بەتايبەتى (ح . ر) خواى گەورە بۆى بكاتە پاداشتى بەردەوام تا رۆژى دوايى.

**(لە دوعاكانتان بێ بەشمان مەكەن)**

**وصلى الله على سيدنا محمد وعلى اله وصحبه وسلم**

ترجمة بعض الكلمات لفهم الجداول الموجود

في هذه الكتاب لناطقين بلغة العربية:

| كوردى | عربي |
| --- | --- |
| چاکه | حسنة |
| خێر | صدقة |
| قورئان | القران |
| خەتمی قورئان | ختم القران |
| نوێژ | صلاة |
| مزگەوت | مسجد |
| یەك | واحد |
| چرکه | ثانية |
| خولەك | دقيق |
| کاتژمێر | ساعة |
| ڕۆژ | يوم |
| مانگ | شهر |
| ساڵ | سنة |
| جار | مرة |
| ئازادکردن | عتق الرقاب |
| ووتی | قال |
| لادان | حُطَّ |
| دەنوسرێت | يكتب |
| سڕینەوەی | مَحَا |
| گوناه | سَيِّئَة |
| بەرزبوونەوەی | وَرَفعَ لَهُ |
| بەهەشت | الجنة |
| دۆزەخ | النار |
| چاکه یەك به (١٠) بێت.. | الحسنة ب(١٠) امثالها. |
| چاکه یەك به (٧٠٠) بێت | الحسنة ب(٧٠٠) اضعاف. |

## المصادر


١. القرآن الكريم.

٢. صحيح البخاري / محمد اسماعيل ابو عبدالله البخاري /دار طوق النجاة سنة ١٤٢٢ هجري.

٣. صحيح المسلم / ابو الحسن مسلم النيسابوري/ دار التراث العربي/ بيروت.

٤. الجامع الصحيح المختصر/محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي/ محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري/١٤٠٧ه – ١٩٨٧م.

٥. الأدب المفرد / محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري / دار البشائر الإسلامية – بيروت سنة ١٤٠٩هجري– ١٩٨٩ م.

٦. سنن ابي داود / ابو داود سليمان بن الاشعث السجستاني/ دار الكتاب العربي / بيروت.

٧. سنن الترمذي / محمد بن عيسى الترمذي / دار احياء التراث العربي/ بيروت.

٨. سنن ابن الماجة / محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني/ دار الفكر العربي / بيروت.

٩. مسند احمد بن حنبل / أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني / دار مؤسسة الرسالة بيروت سنة ١٤٢٠هجري.

١٠. سنن النسائي/أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي/ مكتب المطبوعات الإسلامية حلب سنة١٤٠٦هجري.

١١. المعجم الاوسطة / أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني/ دار الحرمين القاهرة سنة١٤١٥هجري.

١٢. المعجم الكبير / سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني/ مكتبة العلوم والحكم موصل سنة١٤٠٤هجري.

١٣. سنن البيهقي الكبرى / أحمد بن الحسين بن علي بن موسى أبو بكر البيهقي/ مجلس دائرة المعارف النظامية الكائنة في الهند ببلدة حيدر آبادالطبعة الأولى ـ ١٣٤٤هجري.

١٤. صحيح ابن حبان بتحقيق الارنؤوط / محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي/مؤسسة الرسالة بيروت، الطبعة الثانية، ١٤١٤.

١٥. المعجم الاوسط للطبراني / أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني/ دار الحرمين – القاهرة سنة ١٤١٥هجري.

١٦. موطأ امام مالك / مالك بن أنس/مؤسسة زايد بن سلطان سنة ١٤٢٤ هجري.

١٧. شعب الايمان / أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي/ دار الكتب العلمية سنة ١٤١٠هجري.

١٨. تفسير ابن الكثير /أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي (المتوفى: ٧٧٤هـ)/ دار الفكر/الطبعة الجديدة ١٤١٤هـ/١٩٩٤م.

١٩. تفسير الخازن /علاء الدين علي بن محمد بن إبراهيم البغدادي الشهير بالخازن/ دار الفكر – بيروت١٣٩٩ هـ _ ١٩٧٩ م.

٢٠. حاشية الجمل على المنهج لشيخ الإسلام زكريا الأنصاري / لعلامة الشيخ سليمان الجمل/دار الفكر بيروت.

٢١. مجمع الزوائد ومنبع الفوائد / للحافظ نور الدين علي بن أبي بكر الهيثمي/دار الفكر بيروت سنة ١٤١٢هجري.

٢٢. سنن الدارمي / عبدالله بن عبدالرحمن أبو محمد الدارمي دار الكتاب العربي – بيروت سنة ١٤٠٧هجري.

- به کەمترین کات و کار بەرەو لێخۆشبوونی پەروەردگار


٢٣. مسند الإمام عبد الله بن المبارك / عبد الله بن المبارك بن واضح/ مكتبة المعارف – الرياض سنة ١٤٠٧هجري.
٢٤. مسند البزار/أبو بكر أحمد بن عمرو بن عبد الخالق البزار/الناشر مؤسسة علوم القرآن، مكتبة العلوم والحكم/بيروت سنة النشر ١٤٠٩هجري.
٢٥. مسند الشهاب / محمد بن سلامة بن جعفر أبو عبد الله القضاعي /مؤسسة الرسالة – بيروت سنة١٤٠٧ه – ١٩٨٦م.
٢٦. مسند ابن أبي شيبة / أبي بكر عبد الله بن محمد بن أبي شيبة / الناشر دار الوطن الرياض سنة النشر ١٩٩٧م.
٢٧. المستدرك / محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري /دار الكتب العلمية بيروت سنة ١٤١١هجري
٢٨. صحيح ابن خزيمة / محمد بن إسحاق النيسابوري / المكتب الإسلامي – بيروت سنة ١٣٩٠هجري – ١٩٧٠م.
٢٩. الاستذكار /أبو عمر يوسف بن عبد الله بن عبد البر النمري/دار الكتب العلمية – بيروت سنة ١٤٢١ه – ٢٠٠٠ م.
٣٠. مشكاة المصابيح / للعلامة الشيخ ولي الدين أبي عبد الله محمد بن عبد الله الخطيب العمري التبريزي.
٣١. تنوير الحوالك شرح موطأ مالك /عبدالرحمن بن أبي بكر أبو الفضل السيوطي/ المكتبة التجارية الكبرى – مصر، ١٣٨٩ – ١٩٦٩.
٣٢. إكمال المعلم شرح صحيح مسلم – للقاضي عياض /العلامة القاضي أبو الفضل عياض اليحصبي ٥٤٤ هـ.
٣٣. شرح صحيح البخارى ـ لابن بطال/ أبو الحسن علي بن خلف بن عبد الملك بن بطال البكري القرطبي / مكتبة الرشد – السعودية – الرياض – ١٤٢٣هـ – ٢٠٠٣م.
٣٤. شرح السنة ـ للإمام البغوى / الحسين بن مسعود البغوي/ المكتب الإسلامي – دمشق ـ بيروت ـ ١٤٠٣هـ – ١٩٨٣م.
٣٥. شرح سنن أبي داود / أبو محمد محمود بن أحمد بن موسى بن أحمد بن حسين/ مكتبة الرشد – الرياض ١٤٢٠ هـ –١٩٩٩ م.
٣٦. الفتح الكبير في ضم الزيادة إلى الجامع الصغير / جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي/ دار الفكر – بيروت / لبنان – ١٤٢٣هـ – ٢٠٠٣م.
٣٧. تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي /محمد عبد الرحمن بن عبد الرحيم المباركفوري/دار الكتب العلمية – بيروت.
٣٨. فيض القدير شرح الجامع الصغير / عبد الرؤوف المناوي / المكتبة التجارية الكبرى – مصر سنة ١٣٥٦هجري.
٣٩. التيسير بشرح الجامع الصغير / الإمام الحافظ زين الدين عبد الرؤوف المناوي /مكتبة الإمام الشافعي – الرياض سنة– ١٤٠٨هـ – ١٩٨٨م.
٤٠. المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج / أبو زكريا يحيى النووي دار إحياء التراث العربي – بيروت سنة ١٣٩٢هجري.

٤١. عون المعبود شرح سنن أبي داود/ محمد شمس الحق العظيم آبادي /دار الكتب العلمية / بيروت سنة ١٤١٥هجري.
٤٢. تاج العروس من جواهر القاموس / محمّد بن محمّد بن عبد الرزّاق / دار الهداية.
٤٣. فتح الباري ـ لابن رجب / زين الدين أبي الفرج عبد الرحمن ابن شهاب الدين البغدادي/ دار ابن الجوزي – السعودية / الدمام – ١٤٢٢هـ.
٤٤. التحفة الربانية شرح الأربعين حديثاً النووية/إسماعيل بن محمد الأنصاري/مكتبة الإمام الشافعي سنة ١٤١٥ه – ١٩٩٥م.
٤٥. كشف الخفاء ومزيل الالباس عما اشتهر من الاحاديث على ألسنة الناس / العجلوني،إسماعيل بن محمد الجراحي/ دار إحياء التراث العربي.
٤٦. مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح/ للعلامة الشيخ ولي الدين أبي عبد الله محمد بن عبد الله الخطيب العمري التبريزي.
٤٧. اللباب في علوم الكتاب/ أبو حفص عمر بن علي ابن عادل الدمشقي الحنبلي /دار الكتب العلمية – بيروت / لبنان – ١٤١٩ هـ –١٩٩٨ م.
٤٨. شذا الريحان في روائع رمضان / جمع وترتيب: جميلة المصريفي/ دار البيان للنشر والتوزيع/ مصر الطبعة الأولى ١٤٢٩هـ/ ٢٠٠٨م.
٤٩. فقه العبادات _ حنفي.
٥٠. **دەستە گوڵ** / شيخ عبدالله بن شيخ مصطفى/ مطبع الخنساء سنة ١٩٨٩ م.
٥١. ڕووناكي رب العالمين ڕوونكردنةوة منهاج الطالبين/ ملا عبدالله ١٤٢٢ هجری هەولێر.
٥٢. ڕوونكردنەوەی الاربعين النواويە/ عبدالله عبدالعزيز/ كتێبخانەی حاجی قادری كۆيی لە هەولێر.

## تێبینی : چەند زانیاریەك دەربارەی هەندێك لە زاراوەكان

١. ج. واتە (**جزء**) بەش
٢. :ص. واتە (صفحە) لاپەر
٣. : (٥٦٥٦) ئەو ژمارانەی لە ناو دوو كەوانەكاندا هەیە ژمارەی فەرموودەیە.
٤. ئەگەر هەر كەموكوڕیەك هەبوو دەتوانن لە ڕێگایی ئەم ژمارە ٠٧٥٠٤٤٧٦٧٨٤ پەیوەندیمان پێ بەكەن خوای گەورە خێری هەموو لایەك بنووسی.

# بأقل وقت وعمل
# الى مغفرة الله عزوجل

**ئیمانداری بەڕێز**
**بۆ ئەوەی کە تۆش لە کاروانی چاکەکان بێ بەش نەبی ئەوە ئەم ڕێنمایانە ڕچاوبکە:**

١- هەوڵ بدە ئەم پەرتووکە بە ووردی بخوێنەوە وە بەپێ توانا ئەنجامی بدە.

٢- پاش زانینت لە چۆنیەتی زیکرکردن هەوڵ بدە خانەوادەکت بێ بەش نەکەی لەم چاکانە.

٣- هەوڵ بدە ئەم پەرتووکە با چەند مووسڵمانێک سوودی لێ وەربگری خێری بۆ تۆش دەبی بەندی مەکە لەماڵەوە.

٤- ئەو کەسەی خوێندەواری نیە بە ئاسانی بۆی باس بکە کە خێری هەر زیکرێک چەندە تا ئەوانیش بی بەش نەبن لەم چاکانە.

٥- با هەر یەکێک لە ئێمە کەم تەرخەم نەبین لە گەیاندنی زانینی هەر فەرموودەیەک.

٦- خوای گەورە چاکەی هەموو کەسێک دەنووسی ئەگەر تەنها بۆ ڕەزامەندی ئەو بێت.

المؤلف
فاریق ملا اسماعیل

ئەم پەرتووکە بەخۆڕاییە